کەریم دەشتی

# کازێوەی سپیی شیعر

کۆبەرهەم

2010 تا 2018

بەرگی دووەم

چاپی سێیەم

کەریم دەشتی

# کازیوەی سپیی شیعر

کۆبەرهەم

بەرگی دووەم

2010 تا 2018

چاپی سێیەم

شیعر

* ناوی کتێب :کازیوەی سپپی شیعر- کۆبەرهەم - شیعر-2010 2018
* ناوی شاعیر : کەریم دەشتی - -1955 - هەولێر
* ژمارەی سپاردن: 944 ساڵی 2012 هەولێر
* چاپی یەکەم - دەزگای ئاراس 2004 هەولێر
* چاپی دووەم - مەڵبەندی گشتی یەکیەتی نووسەرانی کورد 2012 هەولێر
* ئیمێل karimdashti59@yahoo.com
* ژمارەی مۆبایل 07504512785
* وێنە شاعیر : هێلکاری هونەرمەند محمد اسماعیل
* ئەو شیعرانەی نەخراونەتە ناو ئەم کۆبەرهەمە، پەیوەندی بە ئاستی شیعرەکانەوە هەیەو بەس.

## سیاحەتنامە

1

لە شەقامی چوارچرادا
چوار لالەی بچووکم کڕی
کە هاتمەوە دامگیرساندن
بۆن بخووردی کراسە سپییەکەی کۆماریان
لێهەڵئەسا

2

لە ورمێ لە باخێکی پڕ تەمتومان
یادی ئەوینێ لوولی دام
بە پەلە چوومەوە ڕاژان

3

بەسەر دەریاچەی وانەوە
گۆرانییەکم بۆ ناری چڕی
هەرچی مەلی غەریبی بوو
بۆ سەرشانی من هەڵفڕی

4

لە بۆکان
لەبەر نەوای شمشاڵەکەی قالە مەڕە
شار بۆنی گریان و غوربەتی لێئەهات

5

که چوومەوە قارنێ

هێشتا خوێن

بە سەر خاکدا وشك نەبووبۆوە

کە باران لێی ئەدا ئەبریقایەوە

6

بەسەر پشتی ئەسپی خەیاڵ

بە دەوری گۆڕی شیرازی سووڕامەوە

جگە لە شیعر هیچ شتێکی شارم نەدی

7

کە لە تاکستان بە ئاگاهاتم

غەرقی شەڕاب بووبووم

8

هەمەدان شارێکی چەند دوورە

ئەڵێی پایتەختی دونیایە

سەدەی یەکەمی لێ دیارە

کەچی پڕاوپڕ ئێستایە

9

سنە دەستێکی لە شەیتان گیر بووە

دەستێکیشی لە فریشتە

کچەکانی ئەڵێی ژنەکانی ئەمازۆنن
کە ئەتگرن بۆ ئەبەد بەرهەڵات ناکەن

10

لەسەر گردەکەی شاری بانە
لە دوای ئەو هەموو جەنگانە
جێ پێی عاشقان هەر ماوە

11

لە بەرەبەرەی بەیاندا
تەبریز هەروەك مارێکی ڕەش
دەمی نابووە ناودەمی دیوانەکانی مەولانا

## کەلێسای ئاو

1

بەیروت نە دایکی هەیە نە باوك

نە کچی هەیە نە نەوە

بەیروت تەنها دەریای سپی هەیە

ئەوە بۆ لای تۆ دێم ئەی ئاو

ئاوی سپی

2

گیا لە ناو لیمی کەنارو تاشە بەردەکان خەوتووە

ئاسۆ شەپۆلی

لەخوێنی جەستەی وەرداوە

3

لەدرەختی ئاقیقەوە هاتووم

باوەشم پڕە لە شەوقی شکانەوە

ناو لەپم بۆنی بارانی گرتووە

تەرمی هەزاران شیوەرم

لە ڕۆحمدا هەڵگرتووە

4

مەستێکم لە ترێ

دەمەوێ مەزارەکانت ببینم

تینوێتی ڕۆحی نەخشاندووم
من کە بەندی ناو کتێبی وشکەڵانیم
پێویستیم بە فڕین و زێیەکانی دونیا هەیە
پێویستیم بە ڕەنگ هەیە
لە ئەتڵەسی گەورەی دونیا
زێمارێکی زۆر کزم لە ناو هاواری دارستان

5

بۆ لات دێم ئەی ئاو
مانگ لەسەر دەریا بە تەنها
بەڕووت و قووتی وەستاوە

6

بەیروت کچی تاقانەی دەریایە و لەسەلالەی مەسیحە
هەمیشەو بۆ ئەبەد لە ژێر تریفە ئەوەستێ
سەیری هەیبەت و جوانییەکانی خۆی ئەکات

7

ماڵی فەیرۆز لەبەرزاییەکانەوە دیارە
نووری شیعرو مووەشەحەکانی ئەندەلووسی
لێ هەڵئەسێ
منیش کە ئەمەوێ گۆرانی بڵێم
هەورەکان دێنە خوارەوە
تەمی غوربەت ئابلۆقەم ئەدا

ناهێڵێ گۆرانییەکانم تەواوکەم
دەمەوێ شکاتی دڵی خۆم
بۆ دەریا بەیان کەم
هاژەی شەپۆل گەرووم دەگرێ
کە دەمەوێ تاوێ بگریم
باران دێت و لێ ناگەڕێ

8

بەیروت لە ڕەنگی ئاو دئەچێ
هێندەی دەریای هەڵمژیوە
بۆنی گەوهەرو شەڕابی هەزار ساڵەی لێهەڵئەچێ

9

من تەنیاترین شاعیرم لە لێواری دەریای تۆدا
هەست دئکەم تۆش
تەنیاترین کچی دەریای
لەلێواری ئەم کەونەدا
بایەکانت لە مەچەکی خۆت لوولداوە
خۆت لە پڕووشە پێچاوەتەوە
زەیتی ئەوین بە ئاگری دەریا ئادەکەی
خەمی دونیات هەڵگرتووە

ئەرگیلەی خوا بەبا دەکەی
ئەڵیی تازە لەمنداڵێتی خۆت هاتوویتەوە
هەمیشە چاوت بە ئەشکی گەرم تەڕە
جارجار ئەچیەوە لای بورجی دەریا
شیعری جوبران ئەخوێنییەوە

10

گیا هەر ئەڵێی سەرخۆشە لە لیمی کەنار کەوتووە
مانگ لە ئاسمان سەیری باخی درووز ئەکا
ئەریاش لە نێو ئامێزی تۆدا خەوتووە

11

نەوڕەسەکان تا درەنگان یاری بە تیشکی مانگ ئەکەن
جار جار لە گەڵ شەپۆلەکان ئەچنەوە ناوەندی دەریا
خۆیان و کۆمەڵێ ئاقیق دێنەوە لێواری دونیا

12

ماڵی فەیرووز لەناو مانگە و گیا لە کەناران خەوتووە
نوور لە زێباریا هەڵئەسێ
بەسەر دەریادا ئەپژێ

13

لە بەیروت
ئەوەی حەکایەتت بۆ ئەگێڕێتەوە شەپۆلە

14

لەکۆڕنیشی دەریای سپی

ئافرەتەکان هەمووی کۆتری سپین

15

گیا ورد ورد شەوقی کەشتییەکان هەڵئەمژێ

بەیروت لە لێواری دەریادا

دەڵێی شاژنی بابلە ڕاکشاوە

هەندێ جاریش سەما ئەکا

خەون بە مەریەمەوە ئەبینێ

لەدەروازەی شار چاوەڕێی مەسیح ئەکا

تا خاچەکەی لێ وەرگرێ

خۆی بە کەفچەڕی دەریا و نوور جوان ئەکا

بەڵکو- سن میناس - بێتەوەو

سواری سەرپشتی ئەسپەکەی خۆی بکات و هەڵیگرێ

16

کەس نازانێ

ژمارەی دانیشتوانی بەیروت چەندە

چونکە لەسەر بنەمای شەپۆلە

کەس ناتوانێ شەپۆلی دەریا بژمێرێ

17

بەیروت جارجارە جلوبەرگی قەددیسەکان لەبەرئەکا

مانا ئەڕژێنێتە دەریاو موریدەکانی بانگ ئەکا
جارجار تاجی سۆفیستەکان لەسەر ئەکا
تەرتیلەکانی ئەفسانە دەڵێتەوەو موناجات ئەکا

18

بەیروت بۆ ئەبەد گیرۆدەی خوداکانی دەریا بووە
لە شەقامی سوورا گۆرانییەکم بیرکەوتەوە
دەریا هێندەی هەڵمژی بوو
بوو بوو بە ئاو

19

هەندێ جار سپی سپی
دەچێتەوە کە دەریا پێئەکەنێ
هەندێ جاریش ڕەش ڕەش ئەچێتەوە
کە دەریا ئەگریێ بەیروت وەك پەپوولە ژیانی
لە نێو ئاگری تورەیی دەریاو
پێکەنینی شەپۆل بەسەر ئەچێ

20

کچە جوانەکانی بەیروت کە گەرمایان ئەبێ
جلەکانیان ئەدەن بە دەریا
جەستەشیان ئەدەن بە ئاشقەکان
هەر ئەڵیی گۆڵە پونگن
کە تەنکە تیشکێ لێیان ئەدا

ئاسمان پڕ ئەبێ لە هەڵم

کە دێنەوە وەکو باران

ئەپڕژێنە سەرو سیمای ئاشقەکان

21

بەیروت جگە لە زەمەنی دەریا

لە هیچ زەمەنێکی تر ناژی

بەیروت جگە لە زمانی دەریا

هیچ زمانێکی تر نازانێ

جگە لەکتێبی دەریا

هیچ کتێبێکی تر ناخوێنێتەوە

جگە لە ئەرگیلەی دەریا

هیچ شتێکی تر هەڵناکێشێ

22

بەیروت ئەی پەری دەریا

ئەوەندەی لە دڵم مابوو ئەویشت برد

23

بەسەر کۆڕنیشی دەریای سپی وەستام

جگە لە ژیان، لە جوانی

هیچ شتێکی دیکەم نەدی

**بەیروت 2009**

## هەر یەکەو کەوتنی خۆی هەیە

1

سەرخۆشەکان لە سەلالەی ترێن

کە دەکەون وەکو ڕەزەکان دەژاکێن

وەك پەیمانە وردوخاش دەبن

2

بەڵام هاملێت کە دەکەوێ

کەون دەبێ بە تەمتومان

دانیمارك وردوخاش دەبێ

هەموو زەینێ دەچێتەوە باخی گومان

3

شووشەی عەتریش کە دەکەوێ سەما دەکا

لە پژانیا ئازادی خۆی دەست دەکەوێ

4

کە نەوڕەسێ بەسەر لێواری دەریاکان

قووڵی ئاسمان باڵی دەگرێت و دەکەوێ

دەریا بچووك دەبێتەوە

شەپۆل لە ڕۆحیا دەخەوێ

5

شالیر کەوت، شکسبیر هەڵیگرتەوە

6

کەوتنی فەیلەسووفەکان وەك کەوتنی ئاگر وایە

کە داگیرسێن یەکەم جار خۆیان دەسووتێنن

کە خامۆش بوون

دونیا لەنێو پرسیاری قووڵ دەخنکێنن

7

دڵنیام هەموو دەکەوین

هێندێ بەرەو لوتکە دەچێ

هێندێ لە بنار ون دەبێ

هێندێ دەبن بە فریشتە

هێندێ شەیتان

8

کاتێ کە وشە دەکەوێ

بەناو ڕستەکان وەردەبێ

کەون لە گۆ دەکەوێ

9

نالی کە لە غوربەتی باباندا کۆستی کەوت

بەڵام ئێستاش لەسەر پێی خۆیدا وەستاوە

دەستێکی لە ناو جوانیدا مەلە دەکات

دەستێکیشی  لە تای بەلاغەت چەماوە

10

مەلت دیوە قەتار ئاسمان دەبڕێ

ئەوانیش ڕۆژێ دەکەون

هەندێ لەناو قەفەسی دڵی ئینساندا

هێندێ لە ناو باخی ئاسمان

11

دیستۆفیسکی کەوتە بەر چەقۆی شەیتانان

ڕاسکولینکۆف ڕاستی کردەوە

کە کەوتە ناو فریشتەکان

ئیڤان کردیەوە بە شەیتان

12

کەدەریا دەکەوێ

شەپۆلێکی دەبێ بە تەمبووری بیابان

شەپۆلێکی دەبێ بە خوێنی درەخت

دەریا لەئەزەلەوە کەوتووە

بۆیە هەمیشەلە چەشنی لافاو هەڵدەسێتەوە

13

کە تۆ دەکەوی

ڕەنگە هەندێکت ببێ بە کوپەی شەراب

هەندێکیشت شووشە عەتری ژنی پاشا

یا زینی سەر پشتی ئەسپێ

یا گوڵدانێ لە باخی سێرك

14

تابلۆكان دەكەون

تەواوی فانكۆخەكان

لەگەڵ تەرمی خۆیان دەبەن

هەندێكیان ڕەنگەكان

هەندێ كەون

هەندێ دیمەن، هەندێ خەون

17

كە ئاوێنەكان دەكەون

پارچەیەكیان دەبێ بە مانگ لەناو ئاودا

پارچەیەكیش دەبێ بە نوور

بەڵام هەمیشە پارچەیەكی هەر دەمێنێ

تا مرۆف دڵی ڕەشی خۆی تیا ببینێ

18

بەڵام تۆ ئەی فریادڕەسی من كە دەكەویت

دەبی بە ڕستێ زەنگیانەی

بەرگەردنی كچە جوانەكانی بابل

دڵت دەبێ بە كوانووی ئەوین

دەستەكانت قاپێ میهر

19

که منیش دەکەوم
ڕەنگە ببم بە شەربەی ئاوی بناران
یا کاسەی دەستی ئاشقێ
ڕەنگە ببم بە زنجیری پێی سپارتاکۆس
یا کووپەکەی پڕ ئاگری ئولۆمپیاد

20

بەڵام کە ئاشق دەکەوێ
جوانی لە قۆزاخەی دڵ دەمرێ
کەوتنی ئاشق دونیا چۆل دەکا
هەموو شتێ لە ماتەمدا ڕادەمینێ
کە ئاشقەکان دەکەون
دونیا هەر تامی نامینێ

21

خواکان ئەوانیش دەکەون
دونیا ساف ساف هەڵدەگەڕێ
زەوی چۆل دەبێ لە ترسان
چی مرۆڤە تێکگیر دەبێ
بۆ دروست کردنەوە شەیتان

22

بەڵام کە شاعیر دەکەوێ بۆ ئەبەد هەڵناسێتەوە

کەوتنی شاعیرو درەخت وەك یەك وایە

چونکە شاعیر تاقانەی سەلالەی خوایە

23

سەرەنجام هەموو دەکەوین

کەوتن گریان و ڕمانە

کەوتن دوا ئاوڕی ئینسانە

هەریەکەو کەوتنی خۆی هەیە

## ئەی نادیار

هەموو شتێ بانگم ئەکات
بانگێ لە نوور
بانگێ لە تەم، لە تەمتومان
بانگێ لە وەسوەسەی دڵی شەیتان
بانگێ لە گڕ، لە شەوبۆی برینی ئینسان
هەموو شتێ لەم سروشتە بانگم دەکات
نابێ بوەستم وەستانم داوی مەرگە
ئەوەتا مەلەکان کەس نازانێ بۆ کوێ دەچن
نابێ بوەستم نا
ئەگەر شەو بێ
ئەوە لەگەڵ مانگ قسە دەکەم
ئەگەر ڕۆژ بێ
دەتوانم لەگەڵ ئاوەکان قسە بکەم
نا نابێ بوەستم نا
ئەی نادیار تۆ کێی ؟
ئاخر بانگ موژدەی ئەبەدی مرۆڤە بۆ جوانی
جوانییەك بە مانای جاویدانی
ئەی نادیار هەر دەڵێی
بریقەی دەڕژێیتە بەرچاومەوە

ئەگەر لەبن زەویەکانی من دێم بۆ لات
ئەگەر لە کەنارەکانی من دێم بۆ لات
گەر لە پشتی ئاسمانەکانیشی هەردێم بۆ لات
تۆ هەبیت یاخود نەبیت قەدەری من هەڵکشانە
کە هەبیت بۆ تا هەتا
لە بەر دەرگای جیلوەت دەوەستم
ئەگەر نەبیت بۆتاهەتا بەدواتدا دەگەڕێم
قەدەرم بەندبوونە بە تۆ
من هەمیشە بانگم دەکەن بەرەو تۆ
بڕوانە، کەون بەدارو بەردو باڵندەکانیەوە
دەڵێی شێتن لەباوەشی بێ کۆتایی ئەو فەزایە
هەمووی ئەڕواو جوولە ئەکات
دەوروبەرم هەمووی زەنگی بانگ و خرۆشانە
قیامەتی جوانییەکانی تۆیە
بانگ لە ئاوەکان، لە ملەی شاخ، بەندەرو چۆم
بانگ لە نادیارەوە، لە شیوەرە دوورەکانەوە
بانگ لە قووڵایی دڵی خۆم
بانگ لە ئاونگی سەر پەلکی
دوورترین درەختی تەنها
بانگ لە دەروازەی میهرئامێزی دڵی تۆ
بانگێ لە شەونمی گیا

له ترپەی پێی میوانێکی نادیار
هەمووشتێ بانگم ئەکات بەرەو تۆ
تۆکێی ئەی بانگ و شەبەنگ تۆ کێی؟
ئەی ئەبەدیترین دەنگ
من هەمیشه بەدواتەوەم
ئەگەر دڵۆپێك له مەستی مەی
وەکو سەرخۆشێکی بیابان سوژدەت بۆ دەبەم
یا بازرقەی پەرستگای نووری
هەرچەند له تۆ نزیك دەبمەوە هەر دووری

## ليمۆی شکاو

1

لە نێوان دووکاسەی شکاودا وەستام

کاسەیێ ئاوێنەی دڵمە شکاوە

ئەویتر فرمێسکی چاومە ڕژاوە

2

لەمیانی دوو کتێب داماوم

کتێبێ بەخوێنم نووسراوە

ئەویتر کتێبی ئەوینمە

3

لە میانی دوو خەونی ڕماودا وەستاوم

خەونێکیان شکستی ڕۆحمە

خەونێکی بە سەرچوونی تەمەن

4

لە میانی دوو شیعرا دەسووتێم

شیعرێکیان کە نووسیم باڵی گرت

شیعرێکیش کە نووسیم لە فڕین مانی گرت

5

لە میانی دوو مەمکی پڕ لە شیر ڕادەکەم

مەمكێكیان هی درەختی ئەوین
ئەویتر هی چیا

6

لە میانی دوو چاوی گریاودا هاوارمە
چاوێكیان هی گوڵ بوو هەڵوەری
چاوێكیش هیوا بوو داگیرسا

7

لە میانی دوو حەزی بێ سنوور دووكەڵم
حەزێكیان زێدم بوو ونم كرد
حەزێكیش ئازیزی دڵم بوو، كۆچی كرد

8

لە میانی دوو پاییزدا سەیری باران دەكەم
پاییزێ گەڵاكانی وەراند
ئەویتر وەك ئاشق لە درەخت ئاڵا بوو

9

لە میانی دوو دڵی لە یەك دوور نامەیێ دەنووسم
دڵێكیان مۆنادی ئەبەنووس
دڵێكیش وەك پرووشەی بەفر

10

لە میانی دوو چرای كوژاوە بادەیێ دەنۆشم

چرایێ ڕەشەبا لوولی دا

چرایێ ئەوینم دایگیرساند

11

لە میانی دوو کانی وشك بوو فرمێسکێ دەڕێژم

کانیێ مەل ئاویان تیا دەخواردەوە

کانیێ دوژمنان

12

لە میانی دووشاری ڕماودا دەوەستم

شارێکیان دۆزەخی باربۆسە

ئەویتر کۆمیدیاکەی دانتی

13

لەمیانی بەرزی و نزمییێ تەرمی خۆم دەنێژم

بەرزییێ کە تۆ بووی لە ئاسمان

نزمییێ کە من بووم لە زەوی

14

لە میانی دوو هەرمێ شیلەی خاك هەڵدەمژم

هەرمێیێ بۆ شەڕاب

ئەویتر ئەوە تۆی تۆی سەراب

15

له میانی دوولێوی تینوودا به فرێکم

لێوێکیان هی عاشق

لێوێکیش هی مەعشوق

16

دەمەوێ له میانی دوو چاودا

چاوێ هی نیشتمان

چاوێ هی بەدکاران

خۆڵەمێشەکەی خۆم له قووتی نەمریی کەم

تا بیدەم به ئاودا

# چوزانم ئەوە منم ئیدی

شەو ڕادەشکێ و با دەچێتەوە ئەشکەوتان
مەل دەچێتەوە ماڵی خۆی
شەپۆل لە شەڕی کەناران دەبێتەوە
ئاو دەچێتەوە گۆم و چۆم
هەر من نەبم خەیاڵ سەرم جێ ناهێڵێ
گوتم مەستی نەبێ مرۆڤ بەتەمای چییە لەزەوی
مەستی نەبێ چۆن دەبینەوە بە خۆمان
مەستی نەبێ چۆن دەزانین سەرمان هەیە
بەدەم نووسینەوەی ئەم هەموو شێتیەوە بووم
سپێدە بە تاو لە دەرگای دام
وەك لافاوێ لە ئاڵتوون وبارانێ لە لیمۆ
پرژایە نێو تەك تەكی دەمارەکانم
کە لێوانلێو لە شێتی و بادەو مەستییە
بەپەلە ڕادەکەمە نێو ملی باخچیلەکەم
بۆ چڵی شکاو بەرداخێ خەم دەخۆمەوە
بۆ چرۆی تازەش دڵم بە قومێ بزە دەشۆمەوە
یا دەچمەوە سەر ئەو پەڕانەی
شەوان بە مەستی نووسیومن

هەندێکی جوان، هەندێ وڕینەی شەوانن
چەندێکیان ڕەش دەکەمەوە
جگەرەیێ دادەگیرسێنم
بەخۆم دەڵێم ئەوە چیت کردوە چی
هەرخۆشم وەڵام دەدەمەوە
چوزانم  ئەوە منم ئیدی من
نە پەی بەم گومانە دەبەم
نە هیچیشی لێدەزانم

## شكاندنی بەرد

1

ئەوینی تۆ وەك سروشتی شووشە وایە

کە بۆتە چوارچێوەی ڕۆحم

لە خۆمی لوول بدەم دەشکێ

بەدیاریا بوەستم دەشکێم

2

تۆ وەك ئاگر وای

تا تەواو دامنەگیرسێنی

بڵێسەت کڵپە ناسەنێ

3

زەلیلم مەکە ئەی ئاو ئەی تام و بۆ

منێك هەموو ئەوینی خۆم

لە ئاسمان سەندۆتەوە و داومە بە تۆ

4

من بە کۆتایی هاتنم دەزانم هەی

تۆش بە کوشتنی یەکجاریم

پەی بە ئەوینی من دەبەی

5

ئەی ئەوین ئەی پرتەوی نەخشی مانی

چەند بەخشندەی هەر دەڵێی بارانی

چەند جەللادی دەڵێی لە توخمی شەیتانی

6

پیشەی ئەوین شکاندنی بەردە

چوونە پێشوازی ئاگرە

7

کە ئاویت بۆ ئەوەیە

بۆ تا هەتا لە کەناراندا بوەستم

لەززەتی ئەوین هەمیشە چاوەڕوانییە

8

پرسم کردووە لە کەناران

تۆ چیای یان ئاوی منی؟

پرسم کردووە لە بناران

تۆ بەندەری ئەوینی یا شەپۆلی منی

9

زۆر کەڕەتان ئاوی ئەوینت پێم دەڵێ

فریای خۆت کەوە من تەوقم

گەورەم و تۆ بەندەی منی

شەوقم و تۆ کوژانەوەی ئەبەدی منی

10

ئەوە تۆ نیت دەمخەیتە شیوەری مەرگ

ئەوە منم گەردنم دەخەمە دەستت

11

شوێنێ لە جەستەم نەماوە
بە ئاگری ئەوینی تۆ نەسووتابێ
خوێنم دەکەم بە شوورەی تۆ
گەر دڵۆپێ لە ناو جەستەی منا مابێ

12

هەموو ئاوەکان دەناسم بانگم دەکەن
منیش وا لە غەرق بوون دا
ئەوینی خۆم لەسەر ئاودا دەنووسمەوە

13

تۆ ئەی ئاوی من
ئاوی پەرستگای تەنهاییم
هەموو هەڵرژانێکت سەرەتای ئەوینی منە
هەموو داکشانێکیشت کۆتاییم

14

کە وەك لافاو هەڵدەڕژێی
تازە سەرەتای ئەوینمە
کە دڵۆپ دڵۆپ دامدەگری
تازە کۆتایی مەرگمە

15

تۆ وەك گوڵەگەنمی ژێر تاوێرەکانی

بە بۆن و بەرامەی تاوێر پڕ شیر دەبی

بۆ هەڵمژینی ئەو شیرە

دەبێ هەموو تاوێرەکان وردوخاش کەم

تا وەك مایینی ئاسمانی

لە کەمەندی من گیر دەبی

16

هەندێ جار وا هەست دەکەم

ئەوینی تۆ لە هیچەوە دەمبا بۆ ترۆپك

هەندێ جاریش وا هەست دەکەم

ئەوینی تۆ لە ترۆپکەوە دەمبا بۆ هیچ

17

کە بە ناو ئاوەکاندا دەڕژێی

ئاو ئاوی جاران نییە ئاوێنەی ئەوینمە

18

پیشەی تۆ لەگەڵ من

دروست کردنی مەودایە

بۆیە دەبێ تا ئەبەد کۆیلەی تۆ بم

چونکە ئەوەی کە مەودایان دروست دەکا

تەنها بایە

19

ئەی ئاوی من

تۆ پرسیارێکی چەند سەختی

هەندێ جاریش وەڵامێکی هێجگار سادە

تۆ سەخت بیت یاخود سادە

تازە ڕۆحمت بە بادا

20

تۆ پێوانەی هەموو پێوانەکانی

ڕەهاییت لە ڕەها سەندووە و

کۆیلەییت بەخشیوە بە من

بچمەوە لای تۆ بە دیلی

یا بێمەوە پەرستگای ڕهای جارانم؟

21

تۆ گومانی یا یەقینی

گومانت هەناسەی گرتووم

یەقینت خۆمی لێ سەندووم

22

تازە تەواو هەر دەمکوژی

کەمەندی ئەوینت لە ڕۆحم گیربووە

ئەوین

23

که دەوەستی حیکمەتی مانەوەی منی

که دەڕۆی فەلسەفەی مردنی منی

تۆ عەزابی ئەبەدی منی

24

چی بکەم باشه بۆ ئەوەی

تا ئەبەد لەبەر بارانتا بوەستم و نەکەوم

که مرۆڤ کەوت هێزێ نییه ڕاستی کاتەوە

25

زۆر جاران سەیری ڕەنگت دەکەم

ئەی هەمیشه له من جودا

جگە له ئاو هیچی تر نیت

که ئاو سیمای سەما بێ

من نازانم کۆیلەی تۆبم یا هی ڕەها

26

قەدەری من ڕاکردنه به دوای تۆدا

قەدەری تۆش جێهێشتنی منه

پیشەی ئەوینه نێوانان دروست بکات

27

ئەوینی من تێکەڵ بە حەوت ئاوان بووە

من پەرستی تۆش ئەی ئاب و تاب

تێکەڵ بە مەودای بینینی چاوان بووە

پێم بڵێ تۆ حەقیقەتی یاخود سەراب

28

دەریا شین دەچێتەوە

ئەوە فیزیای ڕەنگەکانی ناو ئاسمانە

منیش کە زەرد دەچمەوە

کیمیای ئەوینی تۆیە

29

من بتخۆمەوە دەخنکێم

تینووم ئەی ئاوی من و ناتوانم بتخۆمەوە

نەتخۆمەوە دەسووتێم

چەند سەختە ئەوینی من

30

تۆ وەك ئاو وایت

تا تەواو نەمخنکێنی

شەپۆلت ئارام ناگرێ

## مانگی شکاو

بە دیار قامیشەڵانەوە وەستام

هەموودەنگەکان هەر تۆ بووی

هەموویان بکەم بە شمشاڵ

هێشتا ئاوازی فیراقی تۆ ناژەنن

2

من تاقە دڵێکم هەیە

تۆ هەزاران هەزار وێنەی

وێنەیەکت لە ئاودایە، مەحاڵە ڕۆحم تێر بکا

وێنەیەکت لە بادایە، کە باش هەمیشە هەڵدەکا

وێنەیەکت لە ناو بروسکەو ئاگرە

لێی نزیك ببمەوە دەسووتێم

وێنەیەکت لە قووڵایی دەریادایە

خۆمی لێ بدەم دەخنکێم

ئاخ چەند دووری وێنەیەکت لە مانگدایە

تا دەیگەمێ ئاوا دەبێ

**

چی بکەم باشە

کە زمان لە وەسفی مەجازت لاڵ بووە

دڵیش جێی تیا نابێتەوە

دریغا ڕابردووم هەمووی هەر ناڵە بوو
ئێستا هاواری ئایندەم لە کام فیغان بشارمەوە
تۆ ئەی با چاو بە بینینت ڕاناگا
بیناییم پەرشی درەخت و
ڕێگای هات و نەهات بووە
بۆوەی لە سیس بوونی ڕۆحم بگەی
دەبێ هەموو دارستانەکان تەی بکەی
**
هێدی بە هێدی ئەی بای تووش
ئەی بای هەڵەموت و هەڵدێر
منێك کە لە عەرشی ستەما
بەندێکم بێ دەست و
سوارێکم بێ شمشێر
**
دڵی من لە سایەی ئەوینت
نەخشەیەکە پڕ لە خەرەند
**
ئەوین تەونێ نییە لە دڵدا کرابێ
کەتۆش بایت
خاچێ نیت لە ڕۆحما درابێ
سەیرکە هەم خەنجەر، هەم ئەوین

له پەنجەی شیعرمدا بوونەتە ئەڵقەی زێڕ

**

تا ئێستا نازانم تۆ بای یا سیمای بوون
کە هەڵدەکەی جوانییەکان وەك ئاو هەڵدەڕژێن
دەوەستی
ئەوینم وەك برینی جەستە
بە باخی ڕۆحما دەپژێن

**

ئەو ڕۆژە لە سپێدە و تابانەوە هەڵت کرد
زۆر گەڵای ڕزیوی ناخم مرد

**

قەدەر بوو ئەوینم تێکەڵی با بووە
چەند سەختە هەبوونم
لە میانی تۆو بادا
بێهوودەیە بوونم

**

تازە من تەواو بووم
چۆن دەتوانم دەستم لە بادا گیر ببێ
کە بای تووش لەمندا
خواش لە غەیب پیر بووبێ

## تۆ لە هەموو شوێنێکی تۆ

پێم بڵێ چیت؟ تۆ بریقەی دڵی نانی
یا ڕەونەقی گوڵی ژاڵەی
بای ناو دارستانەکانی، یا بارانی
تۆ فریشتەی یاخود ئینسانی؟
ئاخ تۆ لە هەموو شوێنێکی و
لە هیچ شوێنێکیش نیت
هەموو شوێنەکان گەڕاوم
تۆ بووی، تۆ نەبووی
لە دەریا بووی بە مرواری
بەڵام چۆنت بناسمەوە
کە مرواری بنی دەریای داگرتووە
لە دارستان بووی بە ئاسك
بەڵام چۆنت بگرمەوە
کە ئاسك لە من باڵ بگرێ
ناکرێ بە دوای بروسك ڕابکەم
لە بارەکان بووی بە مەی
بەڵام چەند جام بخۆمەوە
تا بزانم تۆ ترمیسکی کام دڵۆپەی؟
من هەمیشە بەدوای تۆدا دێم

واهەست دەکەم تۆ لە هەموو شوێنێکی
وەك تەم زەوی و ئاسمانت گرتووە
چۆن باوەشت پێدا بکەم
کە بزانم دەستم پێت کەوێ دەسووتێم
لە گۆڕستانەکان نووری
کە بۆلات دێم لێم ون دەبی
کە دوور دەکەومەوە دادەگیرسێی
لە خەراباتەکان ساقی
دەنگی پیاڵەکانت سەمای کەونە
زیوی ئەوین دەوەرێنێ
وا هەست دەکەم لە بەهەشتام
کە دووبارە دونیا تەی دەکەم
کانیاوەکان بانگم دەکەن
لێرەوەیە ئەوەی دەیبینی هەر خەونە
لە نێو دۆڵەکاندا ڕەنگی
لە نێو تابلۆی مانیدا
هەر کەمەند نیت هەزار ڕەنگی
لە جەنگەکان زام و برین
لە ئەویندا سووتان
ئۆف ئۆف تەنها لە نێو دڵی مندا شین و گرین
ئاخ تۆ لە هەموو شوێنێکی

جارجار لە باكوور بانگم دەكەی
وەك بەفر دەبریسكێیتەوە
هەندێ جاریش لەو سەری باشوور
وەك كەروێشكەی شكارتەی گیا
لە خۆرهەڵات لەتە سێوێكی
لەدەمی هەزاران شمشێر سوور دەچیتەوە
لە خۆراوا لە دەستی هەزاران ئاشق
ئاخ تۆ لە هەموو شوێنێكی ئەی سازو نەی
لە هیچ شوێنێكیش نیت
هەندێ جار وەك با هەڵدەكەی
دەڵێم كۆتایی دونیایە
هەندێ جار وەك ئاو هەڵدەقوڵێی
دوای تەواوكردنی هەموو كتێبەكانی ئەوین
دێمەوە سەر یەكەمین دێڕ
دەڵێم نا نا تازە  تەونی سەرەتایە
هەندێ جاریش لە ناو لەپم دادەگیرسێی
ئاخ تۆ لە هەموو شوێنێكی و
لە هیچ شوێنێكیش نیت
لەهیچ شوێنێكیش نیت

## شکانی باڵەکان

نەهاتنەوەکانی تۆ
من هەمیشە بیر لە نەهاتنەوەکانی تۆ دەکەمەوە
کە لە نەهاتنەوەکانی باز دەچێ
لە فڕینی ئەبەدی خۆی
هەرچی یادەوەرییەکانیەتی، لە دەستی دەچێ
تۆش هەمیشە بیر لە تەنهاکردنی من دەکەیتەوە
کە وەك تەنهاکردنی درەخت وایە
لە ڕەگەوەی هەڵبکێشن
کە هەزاران دڵۆپە ئاوی خاك وخۆڵی خۆی تێدایە
*****
نەهاتنەوەت وەستانی بایە لە ناو لەپی زەمەندا
بەتەنها مانەوەم گریانی زەمەنە لە ناو لەپی بادا
ئەو قەدەرەی لە تۆدا ئاوی فیراقم خواردەوە
قەدەری ونکردنی بەهەشت بوو
ئەوفیراقەی لە ئەوینتا قەدەری خۆمم تیا نووسی
چونە ناوماڵی دۆزەخ بوو
*****
من هەمیشە بیر لە فڕینەکانی تۆ دەکەمەوە

که له فڕینی باز دەچێ
هێلانەی ڕۆحی جێدێڵێ
بێچووەکانی  له بیر دەچێ
تۆش هەمیشه بیر له نیشتنەوەکانی من دەکەیتەوە
که وەك جێ هێشتنی ڕووبار وایه
کەناری خۆی جێبهێڵێ
شەپۆلی خۆی لەدەست بچێ
فڕینەکانی تۆ وەستانی باڵی فڕینه
نیشتنەوەکانی من خوێندنەوەی کتێبی نووره
ئەوفڕینانەی لەتۆدا وەسیەتی خۆمم تیا نووسی
فڕینی جاویدانی بوو له ئەوینی ئەبەدیدا
نیشتنەوەکانی منیش
چەپکەنه کردنی زێ بوو بۆ پرچی تۆ
که دەرگای زێماری کلیل دا
*****
هاتنی من بۆلای تۆ
داگیرسانی بخووره بۆ پەرستگا
دوورکەوتنەوەی تۆ
کوژاندنەوەی نوور بوو له کتێب
له میانی بخووری من و مۆمی تۆ
ڕۆحێکم پڕ له جەخارو

## مەرگی داستانێکە پڕ لە سۆ

*****

من نشتمانێکم نییە جگە لە تۆ

تۆش هیچ منێکت نییە جگە لە نیشتمان

تۆی من بە تەنها کۆچە لەخۆی

منی تۆش بە تەنها گەڕانەوەیە لە تۆ

ئاخ ئەوینی من زریانێکی ئەبەدییە

*****

فڕینەکانی تۆ مردنی ئاوە لە هەور

نیشتنەوەکانی من

زیندوو بوونەوەی هەورە لە ئاو

مردنی ئاو سەرەتای کاڵبوونەوەی هەبوونە

زیندوو بوونەوەی هەور

کۆتایی شینبوونەوەی گیایە

*****

هەمیشە بیرکردنەوەکانی من لە نەهاتنەوەکانی تۆ

کۆتایی بە فڕینی من دێنێ

هەمیشە بیرکردنەوەکانی تۆ لە تەنها کردنی مندا

سەرەتا دەبەخشێ بەدرەختی ڕۆحی من

*****

بیرکەرەوە، باز ئەگەرچی بەرز دەفڕێ

بەڵام هەمیشە لەنزماییدا دەمرێ
بیرکەرەوە، ئەگەرچی من لە نزماییدا دەمرم
بەڵام هەمیشە لە بەرزایی ئەوینتا دەمرم
*****
تۆ هەمیشە لەبەرزاییەکان بەو
منیش هەمیشە لە نزماییەکان
لەکتێبی ئەویندا هەمان ئاوازە
ئاگری سینەخۆش دەکا
هەر شمشاڵە و لە پێکی گریان نۆش دەکا
*****
ئەو ئەوینەی لەمیانی من و تۆ دایە
سەرێکی لە فڕینەو کۆتایی لە هەڵنیشتنەوەدایە
تۆ هەمیشە بفڕە
من هەمیشە دەنیشمەوە
ئەوین داڕشتنی مەحاڵە

## دێــو

دێوێك هەمیشە  دەهات و ئێمە دەلەرزین
شەوان لەترسی ئەو دێوە
جێگامان پڕ لە میز دەكرد
دێوێك هەمیشە دەهات
ڕووبارەكانی شێلوو دەكرد
ئاوایی چەند شەو و ڕۆژێ
بەبێ ئاو سەریان دەنایەوە
دێوێك هەمیشە بەری كانییەكانی دەگرت
مەلان بێ ئاو دەمانەوە و سەریان هەڵدەگرت
دێوێك هەمیشە گوڵەگەنمەكانی خاپوور دەكرد
گرانی دەهێناو خەڵكی برسی دەكرد
دێوێك هەمیشە
كچە جوانەكانی گوندی دەفڕاند
عاشقەكانی خەجاڵەت دەكرد
ناچار خۆیان دەكوشت
دێوێ هەمیشە دەهات
پیاوەكانی دەكوشت و نەیدەشاردنەوە
كەچی ئێستا زەوی پڕ پاڵەوانە
كەسێ نییە ئەم دێوە بكوژێ

# تابان لە مەحاڵدا

لەناو دووکەڵی سەرسامی
کە ئەو هەڵدێ من هەمیشە ئاوادەبم
کە ئەو دەچێتەوە بنار
من دەچمەوە لای لوتکەکان
من و تابان چەند خەمبارین
کەئەو تووڕە دەبێ من هێوری دامدەگرێ
کە ئەو هێور دەبێتەوە
من شەڵاڵی تووڕەیی دەبم
**
تابان جار جار دەچێتەوە مەملەکەتی بن هەوران
ناچار منیش بەسەر هەورەکان هەڵگەڕێم
ئەو خۆی لەدووکەڵی هاوار دەشارێتەوە
من خۆم لەتەمتومانی بێدەنگی ئاشکرا دەکەم
**
لەو شوێنانەی هیچ ڕێگاییێکی خودایان ناچێتەوە سەر
دەنگێ وەك ئیسفەنجی دەریا
وەك ناڵەی ئاسکێکی تەنیا
ورد ورد ڕۆحی بە سۆزی نەی هەڵدەمژتم
**
من و تابان دوو هاوڕێی چەند سەیرین
سەیری من و تابان لەوەدایە
کە دەیبینم ناچارم بگریم
کە دەگریم ناچارم ببینم
کە دەستی لە ناو دەستمایە
هێدی هێدی دەبێ بەئاو

که وون دەبێ بۆی دەگەڕێم
که دەیبینم خۆمی لێ دەشارمەوە
جار جارە بانگم دەکا
دەنگی تۆ ئاخ دەنگی تۆ وەك هەڵرژانی شەراب
شەرابێ دێرین و خەملیو لە کوپە سەوزەکانی کەون
وەك ئاوازێ لە گەڵای بادەم، لە لێواری قامیشەڵانەوە
بادەمێ لە شەهدی گرین لە ڕەونەقی ڕەهایی
وەك دەنگی ئاشقێ لەتای گەرمی ئەوینی خۆی
ئاگر بگرێ و بچێتەوە ناو ماڵەکانی تەنهایی
لە قووڵاییە دوورەکانەوە دەهات
**
من و تابان لە سووتانی ئەڤینێکداین
لە ئەڤینی کەسێ ناچێ
گەرەکمان بوو لە باوەشی یەکتر بمرین
شەوێ لەژێر تیشکی مانگدا
ئاگری سینەمان هەڵگیرسا
کەچی بۆ هەزار ساڵ لە یەك دوورکەوتینەوە
لە شوێنێ خۆمان بینیەوە
شووشەی شکاوی عاشقەکان
وەك شیری سەر پەلکی گیا
وەك بەفر لە ژێر تای یادەوەرییەکاندا دەبریسکانەوە
شمشێرە شکاوەکان لەناو تەمتوماندا
هێندە خوێنی ئەسپەکوژراوەکانیان هەڵمژتبوو
سوور دەچوونەوە
**
ئەڤینی من و تابان چەند سەیرە
لەمەحاڵ دەچێ ومەحاڵ نییە
لە ڕاستی دەچێ و ڕاستی نییە

لەدرۆ دەچێ و درۆ نییە
من وتابان لە ئازارێکی ئەبەدی دا دەژین
من هەمیشە وێنەی ئەو لە بەرد دەتاشم
ئەوهەمیشە وێنەی من لە ئاو
لەوەتەی هەین ئاوا دەژین
نە دەستمان لە یەك گیردەبێ و
نە لە یەکتر جیا دەبینەوە
ئای ئەڤینی من وتابان، چەند سەیرە
**
و شوێنانەی هیچ ڕێگاییێکی خودایان ناچێتەوە سەر
وردە خەیاڵ و ڕامانی، لە نێومەژی سەر دەکوشتم
دەنگێ وەك ئیسفەنجی دەریا
وەك ناڵەی ئاسکێکی تەنیا
ورد ورد ڕۆحی بە سۆزی نەی هەڵدەمژتم
**
ویستم باوەشێ با دەسکەنەکەم بۆ سەر سینەت
ئامێزێ تەم کۆکەمەوە
تا گەردەنت لە شیر بگرم ئەی گوڵ
خەتای تۆ بوو خوێنت بەخشیەوە دەمارم
بەو دەنگەی لەتۆوە دەهات نەتهێشت بمرم
من بووم وام کرد دارستانی خۆر ئاوابێ

قسەم لەگەڵ تاریکی کرد
تا لەگەڵ قەدەر هەڵبکەم
من دەمتوانی یەك یەك تیشکەکانی بگرم
نەهێڵم چیتر ئاوابێ
من دەمتوانی بانگی باخی زەمەن بکەم
تا ڕەونەقی خۆی بگۆڕێ
یاساو ڕێسای ئەم کەونە وردوخاش بکات
دڵۆپ دڵۆپ لەناو ئارەزوم بچۆڕێ
**

خەتای من بوو
من دەمتوانی بانگی تابانی مانگ بکەم
قسە لەگەڵ تاریکی بکات
بۆ چەند ساتێ سووڕی زەوی ڕابگرێت و
کێشی دەریاکان سووك بکات
من دەمتوانی هەموو ئەستێرەکان هاندەم
دەست لەملی خۆرەتاوکەن، ڕێ لە ئاوابوونی بگرن
یا ڕووبارەکان بانگ بکەم
هەر شەپۆلەو تیشکێ لە خۆرەتاو ڕاگرێ
دارستانەکان فێر بکەم بە گەڵا ڕێ لەخۆر بگرن
خەتای من بوو خەتای من بوو

# گەمەی خەیاڵ

هەر دووچاوی وەك دووانەی شەوی ئەبەدی
وەك دوو كانی لە ئەبەنووس
وەك دوو ڕەونەقێ لە فانووس
لە ڕەشایی هەرچاوێکی هەزاران ڕەنگ
لەناو هەر ڕەنگێ سەدان دەنگ
لەناو هەر دەنگێ هەزاران ئاهەنگ
لەناو هەر ئاهەنگێ ملیۆنەها ئاشووب و جەنگ
لەپەراوێزی هەرجەنگێ هەزاران قوربانی
لەسەردڵی هەر قوربانیێ هەزاران تیر
لەسەر هەرتیرێ شووشەیێ ژەهر
لەناو هەر شووشەیێ ژەهر سەدان مەرگ و میر
لەگەڵ هەر مەرگێ هەزاران وەسیەت
لەناو پیتی هەر وەسیەتێ سەدان هاوار
لەهەر هاوارێ زێمارێ
لەهەر زێمارێ گریانێ
لە هەر گریانێ ڕوبارێ
لەهەر ڕووبارێ شەپۆلێ
لەهەر شەپۆلێ ملیۆنان گڕی فرمێسك

لەهەر دڵۆپە فرمێسکێ تەمێ لە شەوق
لەهەر شەوقێ سەمایێ لە ڕوونایی
لە نێو قووڵایی ڕوونایی سەدان پەری
لە سەر باڵی هەر پەرییێ هەزار زەری
لەسەر سینەی هەر زەریێ سەدان قوللاب
لەنێو دەمی هەر قوللابێ هەزار نێچیر
لەناو چاوی هەر نێچیرێ سەدان شکایەت
لە کتێبی هەر شکایەتێ پەڕێ لە عیشق
لەداستانی هەر عیشقێ هەزاران بەدکار
لەناو لەپی هەر بەدکارێ سەدان خەنجەر
لەتیغەی هەر خەنجەرێکا هەزار برین
لەناو دەمی هەربرینێ سەدان زمان
لەناو پەڕەی هەر زمانێ داغونێ
لەهەر داغونێ هەزاران کوورەی سووتان
لەهەر سووتانێ سەدان درەختی خۆڵەمێش
لەهەر مشتە خۆڵەمێشێ سەدان قەقنەس
لەهەرقەقنەسێ سەدان جار زیندووبوونەوە
لەهەر زیندووبوونەوەیێ هەزاران ئەویندار
هەرئەویندارێ هەزاران چیرۆکی ئەوین
لە چیرۆکی هەر ئەوینێ سەدان پەری
کە ئەو پەریانە پەرش و بڵاو دەبنەوە بەزەوی

کەون پڕدەبێ لە شەوق و نووری چیایی
هەر نوورێ دەچێتە چاوێ
هەر چاوێ دەبێتە هەزاران کانی
هەرکانیێ سەد جۆگەلە
کە جۆگەلەکان هەڵدەڕژێن
ژیان پڕ دەبێ لە شەوقی فڕین
دڵیش پڕ دەبێ لە نەوسی گرین
وەرە سەیرکە غایەتی چاوت
چ ئافەتێکی وەهای نایەوە
کەونی لەناو یەك هەرشێلایەوە

# دەگەڕێینەوە لای تۆ

بۆ بەهرام جەمیل

بەئاوازێکی زۆر غەریب بانگم دەکەن
دەڵێن ئەوە چی بوو تۆ نەهاتی
ئاخر ئێمە زۆر لەمێژە چاوەڕوانی هاتنی تۆین
منیش هەرکاتێ بەلایانا ڕادەبورم
تۆزێ بەسەر کەڤرێکەوە دادەنیشم
سەرم بە کێلێکی سپی دەکەم
کە لە سپێتی ڕۆحی ئەوان دەچێ
دەیاندوێنم باسی هەموو شتێکیان بۆدەکەم
گیای سەر گۆڕەکانیان دەکەونە سەما
دواجار کەهەڵسام گریا زۆر گریا
گریانێ لە هەورەکانەوە دەهات
منیش لەگەڵیا کەوتمە گریان وپێم گوت
پەلە مەکە ئەمڕۆش نەبێ سبەینێ هەر
بارمان لای تۆ دەخەینەوە
سەبرت هەبێ
هەموو بە یەك دەگەینەوە

ئەو سپێدەیەم لە بیرە
سەرت هەڵبڕی بۆ ئاسمان
وتت  جوانی لە کەلێنی تاشە دایە
جوانی لەنێو ئەشکەوتی بناران دایە
ئێوە جوانیتان نەدیوە
لێرە لە نێو ئەم خۆڵەدایە
ئەودەم ڕەوێ
ئاسمانی شینی شەق دەکرد
وتت جوانی لەنێو باڵی ئەوان دایە
ئەو نیوەڕۆیەم لەبیرە
باوەشێ بات هەڵگرتبوو
ڕۆحت دابووە بەر نووری ڕوون
بەسەر هەورەکان دەکەوتی
لەوسەرەوەش قاپێ شیعرو
چەند دێڕ ئەوینت دەنۆشی
لەناو کتێبان دەخەوتی
ئەو ئێوارەیەم لە بیرە
ڕات دەکردەوە بناران
لە پۆڕی کێوان ڕادەمای
هەندێ جاریش
گۆرانییەکەی جاری جارانت دەچڕی

دەسماڵەکەت دەردەهێنا
شەڵاڵی بۆنی خاك بوو بوو
نەرمە فرمێسکی خۆت دەسڕی
ئێستاش منم وا فرمێسکت بۆ دەڕێژم
شەو ڕادەشکێ
هەر بیر لەتۆ دەکەمەوە
کە شەو دادێ
وەکو عەتری باخی شەوبۆ
بۆنت دەپڕژێتە ڕۆحمان
بەیەکەوە هاوار دەکەین پەلە مەکە
ئێمەش دەگەڕێینەوە لای تۆ
ئێمەش تێکەڵ بە خاك و خۆڵی تۆ دەبین
گیا لەسەر گۆڕەکانمانا شین دەبێ
کەباش بەسەریا هەڵدەکا
بەسەرپشتی نادیاری شەو و شەوبا
دوا گۆرانی و ماڵاوایی
بۆن و بەرامەی ئازیزان
بۆ هەموو ماڵەکان دەبا

# هەولێر

یەکەم جار لەناو باخی بەهاو بەهێدا
بە تەنها هێیەك بوو
چی هەورو هێلانەو هەیبەتی مێژوو بوو
هەر هەمووی هەڵمژی
ئەوەندە هاواری خۆی سەردا
تا بوو بەو قەڵایە
ئەو قەڵا باڵایە
هەر دەڵێی شاژنی سەر عەرشی میدیایە
دیرۆكو لەشكرو پاشایە
ئای لەم (هێ)یە جوانە
هەر دەڵێی بەهێیە خودایە
دوەم جار واوێك بوو
بوو بە وانەی وارو
وڵاتی خستەسەر زمانی ئەم كەونە
ئەم واوە گەورە، گەورەبوو
ئێستاكەش هەر دەڵێی
درەوشانی خەونە
سێیەكەم جار لامێك بوو

لاوك‌و لافاوو له‌رزشی ئه‌ڤینی
به‌ردایه دوژمن‌و
شه‌مامه‌ی سروشتی هاویشته ناو ده‌ستان
خورپه‌ی خسته دڵان
هه‌زاران هه‌زار شێر له بێشه هاتنه‌ده‌ر
تا بوو به بێشه‌ڵان
چواره‌م جار (ێ) یه‌ك بوو
له‌میانی پرسیارو وه‌ڵامی سه‌رزه‌مین
هه‌ر به قه‌د دێیه‌ك بوو
بۆ دڵی عاشقان
هه‌م په‌ناو هه‌م تاقه جێیه‌ك بوو
خودایه نازانم ئه‌م جێیه
له به‌هه‌شت له کوێیه؟
پێنجه‌م جار ڕێیێ هات
چ ڕێیێ ؟
نارنجی ڕۆناهی خسته ناو ڕۆژهه‌ڵات
ئێستاکه‌ش ڕۆژهه‌ڵات
وه‌ك خانزاد له‌جێوه
به‌م تیشکه ده‌ڕواتن به‌ڕێوه
ئێستاکه‌ش به‌م هه‌موو پیته‌وه
دڵۆپێ شه‌ونمه له جوانی

خودایە ڕەونەقی جارانی کوانێ؟
کە ئێمەش بەندەی تۆین
عابیدو زاهیدو سۆفی تۆین.

* ئەم شیعرەم بەشێکە لەوەفام بۆ ئەو شارەی منی هێناوەتە کایەوە

# هەڵوەشانەوەی تەونێك

1

ئەو تەونەی بۆ جوانیم چنی بوو
سەرێکی لە نووری ئەبەدی و
سەرێکی لە شەوقی خودا بوو
فێڵەکانی نەخشم لە شەیتان دزی بوو
هەر تاڵە ڕەنگێکیم
لە گڕی دۆزەخێ هێنا بوو
ئارمووش و شەباقەم
شەلاڵی خوێنی خۆم کردبوو
لەهەر مەملەکەتێ وەستایێ کارامەم
بۆ دەزگای چنینی هێنابوو
شەوقی جاویدانیم ڕشتبووە ئەدگاری
بە ئەوینی پڕ تین
ڕۆحێکی ئەزەلیم وەبەرنا
ئەو تەونەی بۆ جوانیم چنی بوو
شیرازەی لە تیشکی شەفەق بوو
تانو پۆی لە دەزووی شیرازو
ڕێتواڵی لە خەونی بەهێ بوو

نەخشەکەی لە تابلۆی مانی بوو
ئەو ئاسکانەی لەنێو ئەم تەونە
زەندۆڵ و گەوەیان تەی دەکرد
ئاسکی دیوانی پڕ میهری خانی بوون
ئەوکانییەی لەو تەونە هەڵدەقوڵا
ئاوەکەی فرمێسکی فیراق و
زیخەکەی بنەوانی خەمگینی دڵم بوو
ئەو تەونەی بۆ جوانی چنی بووم
بەپەنجەی هەزاران شاپەری خەملّی بوو
هەزاران هەزار غوڵام ڕایەڵیان دابۆوە
جۆبارێ لە قەفقاس بەناویا هەڵدەڕژا
گوڵاوێ لە ئامەد بەسەر وێنەی تۆ هەڵدەپژا
پیتی ناو ئەم تەونە
کەروێشکی سرك بوون
بەنێو دارستانی تەون پەرت دەبوون
تەونێ بوولە تەمی ترۆپکان
لە شاخی کەڵی چیا ئاڵا بوو
کەبایێ بەناویا دادەهات
هەزاران سکڵی ناوئەم تەونە
وەك چرا هەڵدەچوون

2

ئەوتەونە چی لێهات خودایە
هەر تاڵە ڕەنگێکی چووە ناو دۆزەخێ
ئارمووشە جوانەکان، چۆن وا کاڵ بوونەوە
وەستاکان کەوتن و چوونەوە غەریبی
ڕوناهی چاوانم کوژاوە
تیشکەکانی شەفەق ئاوا بوون
تانوپۆ هەڵوەشا
ئاسکە جوانەکانی ئەم تەونە
کەوتنەبەر قامچی ڕاوچییان
کانییەکان وشکیان کرد
شاپەریان چوونەوە بارەگای خودایی
غوڵامکار دایانە چیاکان
جۆباری قەفقاسییان لەم تەونە دابڕی
گوڵاوی ئامەدیان نایەوە ناو شووشە
پیتەکان وەك مەلی لە ئاوکراو هەڵفڕین
تەمی سەر ترۆپکان لەو تەونە ڕەویەوە
شاخی کەڵ وەك ئەژنۆی من شکا
بایەکان بایەکان باریان کرد
سکڵی سەر نەخشەکان بوونەوە خۆڵەمێش
ئەوەی ماوە
هەر تەنها زیخەکەی خەمگینی دڵم بوو

# جانگی ئێمە

ئێمە کۆمەڵە ڕۆحێکین، بە نیکۆتینی شەڕ کەوتوو
ئێمە کۆمەڵە گەنجێکین، بە ڤالیۆمی سەفەر خەوتوو
ئێمە کۆمەڵە هەستێکین، بە خەنجەری ڕق بریندار
ئێمە کۆمەڵە تەونێکین، لە دیدی جەنگەڵی تەپیو
ئێمە کۆمەڵە برینێکین، لە خەمی مێژوودا ڕزیو
ئێمە کۆمەڵە گورگێکین
بەبۆنی خوێنی یەکتری سەبر لە گیانمان نامێنێ
ئێمە کۆمەڵە ڕەنگێکین کە تێکەڵی یەکتر دەبین
وەك جەستەی پەلکەزێڕینە
هەموو یەکتر دەسڕینەوە دەبین بە شێرەبەفرینە
ئێمە کۆمەڵە ڕەندێکی چیایین
کە تێکەڵی چڕە دووکەڵی شار دەبین
کەڵبەمان تیژدەکەینەوە
هەموو پێکەوە هار دەبین
ئێمە کۆمەڵێك نەرسۆسین
بەجوانی دەستکرد شەکەت بووین
ئێمە کۆمەڵێك سادیستین
لە غەدداریا سەقەت بووین

## دەمەوێ شار ببینم

من سەر بە بەرد دەکەم و نان‌و ئاو دەخۆم
لەو پەڕی شەکەتیشدا بە شاخی گا
گۆزەیێ شەڕابی کۆنینە دەخۆمەوە
کابرایەکی سادەم
لەژێر ئەستێرەکان دەخەوم
لە کوختەکەی ئەو بنارەو
لەو بستە ئاسمانەی سەرم زیاتر
هیچ شوێنێکی دیم نەدیوە
تا ئێستاش هەر وا دەزانم
ئەو ڕووبارە دوا سنووری دونیایەو
ئەو درەختەش بڵندترین درەختی ئاسمانەو
ڕەشماڵەکەشم جوانترین تەلاری زەوییە
هەمیشە بۆنی دووکەڵ
دەفتەری جگەرەم لێ دێ
بۆنی شەڕاب‌و گۆشتی کەروێشك‌و
بۆنی پونگی ئەو کێوانەم لێ دێ
ئێستاش چوزانم خۆم‌و ئەسپە سوورخنەکەم
ئەو ئەسپە سوورخنەی کچە قەفقاسییەکە پێی بەخشیم

حەوت شەوو حەوت ڕۆژ غارم دا تا ڕامم کرد
بەڕێ کەوتووین هەرچۆنێ بێ دەمەوێ بگەمە شار
ئەو شارەی بنی لە بەحرەو سەری لە هەور
وەهمێکە دیارەو دیار نییە
هەرچەند دەگەمە لێواری
ئەو دوورتر دەبێتەوە
دەمەوێ بگەمە ئاهەنگێ
چوزانم کام رێ بەرەو ئەوێم دەبا
لە کام گەڕەك و کام جێیە؟
یا کێ سەمای تیا دەکاو
کێ شەرابی تیا دەخواتەوە
گرنگ ئەوەیە خۆم و ئەسپە کێوییەکەم بگەمە شار
کە ئێستاش نووشتەو گوڵیلکی
کچە قەفقاسییەکەی بە یاڵەوەیە
ئای شار چەند دووری
دەڵێن تەلاری بەرزو منارەو
قەڵاو چەرخو فەلەکی ئەفسوونی تیایە
کچە سفوورەکان بەسەر شەقامەکانەوە
پرچیان بەرداوەتەوەو
دەستیان لەناو دەستی کوڕان ناوە
دەڵێن شار زۆر خۆشە زۆر

من خۆم هیچم نەبینیوە
ئەسپ و ڕەشماڵ و ئەم بنارە نەبێ
ئەسپەکەم، ڕۆحەکەم، باوانەکەم
خێراکە ئەوەتا لە دوورەوە
شەوق‌و شەباقەی گلۆپەکانی شار دیارن
لە خەون دەچێ
دڵم زۆر خێرا لێدەدا
من کابرایەکی سادەم دەمەوێ بگەمە شار
چوزانم کێ دەڵێ لەو ئاهەنگە
ئەو قەفقاسییە نادۆزمەوە
بەڵام خۆ نە دەزانم سەما بکەم
نە دەزانم گۆرانی بڵێم
گرنگ ئەوەیە بگەمە شار
بچمە ناو ئەو ئاهەنگەوە
بەڵام کەس نازانێ وەك من بخواتەوە
ئەوسا کە مەست دەبم
خۆم بە کەسیان ناگۆڕمەوە
هاوار دەکەم ئاهای خەڵکی شار
ئێوە نازانن گۆرانی بڵێن
لێگەڕێن من مەستترتان بکەم
ئەوسا کچە جوانەکان

چوار ناڵە هەڵم دەگرن
منیش بە ئەنقەست، خۆم قورستر دەکەم
تا باشتر لە گۆشتی باسکیان ڕۆبچم
بەرەو گیتارە گەورەکەم دەبەن
ئەوسا گۆرانیەکەی خۆم دەڵێمەوە
ئەو گۆرانییەی کچە قەفقاسیەکە
لە یەکەم شەوی ژێر دەوارا فێری کردم
ئێمە کۆمەڵە خەڵکێکین جگە لە شەڕاب
کە خوا بۆ ئێمەی دەنێرێ هیچی دیکەمان نییە
ئێمە کۆمەڵە خەڵکێکین جگە لە گۆرانی
کە خوا فێری ئێمەی کردوە هیچی دیکە نازانین
ئێمە کۆمەڵە خەڵکێکین جگە لە عەشق
کە خوا فێری ئێمەی کردووە
هیچ کارێکی دیکە نازانین
ئا ئەسپەکەم .. تاقە زێدو گراوی خۆم ڕێ کەوە
ئەوسا کچە قەفقاسییەکە کە گوێبیستی من دەبێ
بە پشتی یادەکانیەوە دەگەڕێتەوە ڕابردوو
ورد ورد منی بیردێتەوە
چۆن بەسەر شانمەوە هەڵدەگەڕاو کرۆسکی دەچنی
منیش لەژێرەوە لەبەر ئاگری
ڕانە سفتو لووسەکانی

هەموو گیانم داخ دەبوو
بیری دێتەوە چۆن بەسەر پشتی ڕووتمەوە
لەو ڕووبارانەم دەپەڕاندەوە...
کە لەژێریا هەستم بە نەرمی سینەی دەکرد
ئەوسا رادەکاتە سەر شانۆ لەبەر چاوی شار
دەم لەناو دەمی من دەنێ
هەموو دەڵێن ئای ئەم گۆرانیە چەند خۆشە
لە گۆرانی ئێمە ناچێ
دەست لەملانێی ئەوانە چەند سادەو پاکە
لە دەست لەملانێی ئێمە ناچێ
بەیەکەوە غەرقی نوورو
گوڵبارانی شار دەبین
ئا ئەسپەکەم ..باوانەکەم
غەرقی چەپڵەو زریکەی عاشقان دەبین
کە تەواو دەبین دەستم دەگرێ
دەمباتە هوتێڵە گەورەکە

بەسەر سنگیەوە خەوێکی قووڵ دامدەگرێ
چوزانم کێ دەڵێ وادەبێو
چوارپەلم ناگرنو فرێم نادەنە دەرەوەی شار
من کابرایەکی سادەم
هەمیشە خەون بە شتە خۆشەکانەوە دەبینم
بایەخ بە شتەکانی پشت پەردە نادەم

# من و با

1

من و با چووینەوە ماڵە دێرینەکەی مەولانا

پێکەوە هاوارمان کرد کوانێ

دەفی تۆ مەولانا کوانێ کوا

شەوقی گۆڕێکی دوور غەرقی نووری کردین

بەو شەوقە چووینەوە ماڵی خوا

2

بە خوناوی سپێدە لەسەر پەلکی گیا نووسیمان

من و با هەردووکمان لە تەباری شووشەین

لە درزو شکانی ئەبەدی نزیکین

زۆرجاران لەماڵی هەرمێدا

جێی خۆمان ڕادەخەین

جارجارەش بۆ ئەبەد ڕادەکەین

3

لەماڵی ئاوینی شەونما

لامداوە و پێم گوتووە

نهێنی ئەو ڕازە بە خوناو لە سەر پەلکی گیا بنووسێ

خۆشم کە دەچمەوە ئاوەکان

بەڕەنگی گەڵای پونگ

،سەر تاشە بەردی لێواران ئەو پەندە دەنووسم

4

من و با دەنگێکین

لە ڕۆحی ڕەوەزا هەڵدەچین

لە نێو ترپەی باران مەست دەبین

لە نێو جەستەی گیا تا ترۆپکی شێتی

لە مەداری سەما ڕەت دەبین

5

من و با هەردووکمان بەناو ئاودا

دەچینە ناو ماڵی کەوناری تەمتوومان

مشتێ لە شەپۆلی زیوین و

لە دارستانیشا  باوەشێ جریوە

لەگەڵ خۆماندا دەبەین بۆ دەریا

6

کە بەناو شەوەزەنگی جوانی ڕەت دەبووین

کتێبی مەرگمان خوێندەوە

بۆنی عەترو مازی

ئێمەیان بۆ باخی مناڵی بردەوە

7

من و با لە تەباری ئەشقێکی تەتەرین

لە ناو ڕەوەی مەل و ڕەوەزی شاخەکانی ئاسك
لە ناو ماڵی گیادا
بووکی شەونم دەبەین بۆ سپێدە

8

بە خوناوی سپێدە لەسەر پەلکی گیا نووسیمان
چووینەوە سەر تاشەی بناران
بە دڵۆپەی باران گەڵای دارمان دواند

9

من و با سەفەرمان درێژە
جار جارە لە ماڵی پەپوولەی پاییزی لادەدەین
چەند قومێ لە جوانی
هەرایێ لە شەپۆل
فڕینێ لە مەل و
باوەشێ لە کەروێشکەی گیا ڕادەخەین
دەزانین ڕۆژێ دێ وەك شووشە
دەچینە باوەشی درزێکی ئەبەدی

10

تۆ ئەی شیعر ئەی تەونی ناو لەپی نهێنی
ئەی تۆ نیت دەتەوێ بچیەوە ئاسمانان
ئەی تۆ نیت بانگی ڕۆح دەکەیت و
جارجارە لە خوێنمان سەردەدەی

دەتەوێ ئاگر لە جەستەی خۆت بەربدەی

11

ئەی شیعر ئەی پیانۆی ڕەنگ و بۆ

ئەو ڕۆژە لە زەردێنەی خڕی ئاسۆدا

با لە پرچی کەون ئالا بوو

منیش لە وەسوەسەی جوانی تۆ

12

با ئەی با

کەی ئاخر دەمتوانی لە نهێنی تۆ بگەم

تۆ نەبای ئەی شیعر

ئەی نەخشی گەردنی ئاسکەکانی مانی

13

جارێکیان بای ئەزەل

نهێنییێکی بچوکی بۆ دڵی من درکان

لەوساوە تا ئێستا

ئەو دڵەم خول دەخوا لە مەداری بوڕکان

## زمان و زەمان

چی بکەم باشە؟

بۆوەی تۆزێ بوەستیت و وچان بگری

ڕۆحم لە سیمات گیربێ و

دەستم داوێنی تۆ بگرێ

تۆ ئەی شووشەییترین زێ تۆ

تۆ ئەی نادیارترین ڕێ تۆ

تۆ ئەی تۆباویترین مەملەکەت تۆ

هێزی زەمانت لە دەستەو من هی زمان

مەرگ لە سووڕانەوەی تۆ دایە

بەڵام دارشتنی جوانی

لە ناو زمانی مندایە

چی بکەم باشە بۆوەی بتوانم ڕاتگرم

ئەی قوفڵی کەوتنی زمانم

با جوانیت لە سووڕانەوە نەکەوێ

تا هێندێکی تریش

لە ڕووناکی تۆم بەرکەوێ

من ڕاکردووی هەمیشەیی

دوای سووڕانەوەکانی تۆم

تا دووبارە بتدۆزمەوەو بگەم بە خۆم

## کتێبی نوور

1

تۆ کتێبی نوور و درەختی ناو تەمتوومانی

تۆ کتێبی شەوق و سەرەتای بوونەوەی زمانی

بەر لەوەی ترێی ناو ڕەزەکان بکوشرێ

ببێ بە شەڕابی هەرهەری

من لە تۆدا مەست بووم

مانای تۆم دۆزییەوە

2

تۆ لە کام با هاتووی کە بەسەر زەویدا ڕەت نەبووە

تۆ لە کام گوڵە گەنم جیلوەی خۆت داگیرساند

کە هەرگیز گەڵاپونگی وا جوان

لە کیڵگەی ئەویندا شین نەبووە

3

شلکە یاسەمینێ ئەوینی لە سارای دڵما چاند

خەمگینی ئەوینت ئاوی دا

دەستی تۆ بۆ نەمریی ساوی دا

4

سەد ساڵە وەستاوم

ژمارەش تەواو بوو نەهاتی
هاتنت بارینی ڕووناکی خودایە
داگیرسانەوەی خۆڵەمێشە
خەسترین شەڕابی سەمایە

5

سەد ساڵە وەستاوم
سەبووریش تەواو بوو نەهاتی
هاتنت شەڕابە کەون سەرخۆش دەکا
سینەی من پڕ تیشك و جۆش دەکا

6

ئەگەر تۆ تەواوی من نەبیت ئەمن چیم
ئەگەر من تەواوی تۆ نەبم ئەتۆ چیت؟

7

ئێمە دوو دڵۆپەی ڕووناکین
تێکەڵی یەك نەبین سەر زەوی بێ شەوقە
گەردەنی ئەبەدی لە ژێر تارای تەوقە

8

سەد ساڵە وەستاوم
ژمارەکان تەواو بوون
ئاوازێ نەماوە
لە بەرامبەر درەختی تەنیایی نەیچڕم

سەرسامم ئایا تۆ هەی یا نیت؟

9

ئەگەر هەیت

لە کام با تێکەڵی ئاوازی سەما بووی

لە کام تا تێکەڵی تامەزرۆو تەما بووی

ئەگەر نیت لە کام پێك

لە ئاوازی قامیش جودا بووی

لە کام نەی فیراقت خواردەوە

لە کام ڕاز شیرازەی ئەزەلت شاردەوە

10

کە تۆ هەی شکۆفە دەبنەوە

کە تۆ نیت هەموویان بۆ عەدەم دەچنەوە

11

ئەوەتا ڕێگاکان پڕن لە ئاوێنەی شکاوم

لە ئاوێنەی جوانی تۆدا دەژیم

ئەگینا چۆن ماوم؟

12

من لە سەر هەموو ڕێگاکاندا وەستاوم

لە ژێر بارانەکاندا

ئاقیقی خوێنی خۆم دەبەخشم

بە درەختی تێنووی هەنگاوم

13

شەڵالی تەمتوومان و ئاو و درەخت و بارانم

بەڵام ئاخ بمەوێ ساوت دەم

هێزی چاوم دەشكێ

دەكەومە خەڵوەتی جارانم

14

تۆ لەناو ڕووناكی بریقەی ئەزەلی

بەسەر هەموو ڕمێكەوەی

بۆ گیانم هەڵبكا

بۆ كام لا ڕێ بگرم

شەوقی تۆ لەشكرە و ئابلۆقەی من دەدا

قەدەرمە ڕووناكیت بمكوژێ

# کێوی سپی

ئەسپێ لەزیو، لە تەمی چیا
ئەسپێ لە پونگ
لە بۆنی پێکی باخۆس و لە تەونی گیا
وەك کچێ لە ئارمووش
ئێستا، تازە دەرگای لێ والآ کردبێ
یا شاعیرێ تازە شیعرێ
وەك گوڵەگەنمی بەرباران
لە ناو پەڕی زمانی باڵای کردبێ
لە دوورەوە لەناو هەزاران کێوی سپی
بانگی کردم
سواری سەرزینی خۆی کردم
کە بەرەو ڕابردوو دەبۆوە
لەبەرەخۆ گلەو گازاندەی لێ دەکردم
ئەوە چیتە؟ دەڵێی بوویتەوە مناڵ
بۆ نازانی ئایندە گوڵی نایلۆنە
نە ئەوین لەیەخەی خۆی دەدا
نەشیعر بۆ ناو باخچەی ئەبەدی خۆی

ڕێی پێ دەدا
تۆ چیت هەیە جگە لە ئەوین و شیعر
تۆ چیت هەیە جگە لە باوەشێ خەون و
لە گۆزەی دڵێکی پڕ میهر
ئاییندە ئاگرێکە دوور
ئێستات گەرم ناکاتەوە
تۆ چیت هەیە جگە لە کوپەیێ شەڕاب
دونیات بۆ بچووك کاتەوە
- ئێستا - چییە دیلە دیل
من دەتبەمەوە ڕابردوو
بە هەموو لایەکدا دەچێ
قەڵا و شەوق و منارەکانی
سەمای زۆرباو باڕەکانی
تۆ چیت داوە لە ئایندە
ڕابردوو ئاخ ڕابردوو تۆپێکی خڕە
ڕابردوو قەڵای شەترەنجە
مەلیك لە کوێ وچان بگرێ
بۆوەی تاجی جاویدانی لێ بسەنێ
دڵنیابە لەوێ دەمرێ

# تۆ بۆ ئەبەد تۆ

**هێندە صورەت زۆر بووە**
**مەعنا لە بەینا ون بووە**
**حاجی**

فێڵی ڕۆحە یا هی چاوم؟
چوار کەس بووین لە ئاوی وێنەدا
هەموویان چوونەوە ناو باخی ئەبەدی
بە تەنها من ماوم، دەزانم ڕۆژێ دێ
کە سەیری هەمان وێنە دەکەن
دەڵێن ئاخ هیچ یەکیان نەماون
**

ڕۆحی من وەك ئاوێنەیەکی کۆنینە
لە هەزاران هەزار جێگادا شکاوە
چوومەوە بەر ئاوێنەی جاران
دووبارە سەیری خۆم کردەوە
زانیم ڕۆژگار چۆن هاڕیومی
کە ئاوێنەی ئەوینی من شکا
بۆ ئەبەد لە ناویا بزر بووم
**

چوومەوە لێواری ڕووباری گە نجێتیم
تا ئێستاش شوێن پێی ئەو
بە سەر لیمی کەناردا هەر ماوە
**
دوا گەڵای ئەو درەختەش وەری
تەمەنم بە سەر چوو نەهاتی، سەرووەرم
ڕۆژێ دێ کە منیش وەك گەڵا بوەرم
**
بریقەی زیوینی یادێکە
لە هەزار گەوەدا دەپرژێتە درزی برینم
چاوم پڕ لە شەوقی ڕێ دەکا
بریقەی ئەوینی دێرینە
بیابانی ئەوینم پڕ ئاوی زێ دەکا
**
دەنگی با هات
زانیم ئەوینی کوژاوەم گڕی گرت
پەنجەرەکەم کردەوە
تۆم بینی دوور یەکجار دوور
پەنجەرەت دادەخست
**
کە بەسەر لێواری دەریای ڕەشدا وەستام

ئەخاب-م بینی چەپکێ گوڵی سپی سپی
لە یەخەی مۆبی دیك دەدا
بەڵام کە چوومەوە دەریای سپی
زۆربام بینی لە کانی خەڵووز دەهاتەوە
ڕەش ڕەش هەر وەکو ئەبەنووس

**

منیش وەك تۆ گیانم پڕ بووە لە نوور
زمانم پڕ بووە لە ئاواز
مەگەر سووتوو سیفەتی ئاگر ناگرێ
یا عاشق ناچێتەوە سەر مەعشووق؟

**

منیش وەك تۆ شەوقی ئەوینم هەڵدەچێ
مەگەر سووتاو
خەسڵەتی سووتێنەر ناگرێ؟
منیش وەك تۆم هیچ ڕوخسارێکی دیم نییە
مەگەر بەندە هەمان سیمای ڕەهای نییە؟

**

هەمیشە کە بەرەو تۆ دێم
ئەی دوا وانەو دوا کەمەندم
تەنهاو تەنها من یەك چارەنووس شك دەبەم
ئەویش مەرگ و فەنا بوونە

بەڵام هەمدیس ناچارم بێم

**

تۆ سافترین وێنەی ڕۆحی

بە هەزار ڕەنگ بۆ ناو سینەی من دێیتەوە

تۆ پرسیاری ئەبەدی منی

بە هەزار دەنگ وەڵامی من دەدەیتەوە

**

ئەوەی زمان گۆی دەکات و دەیڵێتەوە

هەرگیز بەو بێدەنگییە ناگا

کە بۆ پێشوازی تۆم هەڵگرتووە

ئەو وێنەیەی هەمیشە چاو پێوانەی دەکاو دەیبینێ

قەت ناگاتە ئەو وێنەیەی

لە ناو دڵما ڕەنگی ئەوینی گرتووە

ئەوناڵەیەی تۆ دەیبیستی

قەت ناگاتە ئەو ناڵە بێ سەدایەی وا لە دڵمایە

ئەوەی کە دەست ساوی دەدا

هەرگیز ئەوە نییە کە دڵ دەستی پێدەدا

**

تۆ ئەی سەمەندەری ئاسمانی من

بۆ ئەبەد هەرچییەك بۆ تۆی دەنووسم

دەبێ بەسەریا بچمەوە

چونکە هەمیشە شادێڕەکانی
بە فرمێسکی چاو کوژراون
**
من وەك تەرمێکی سوور
ئەوین لەناو تابووتی سینەی سپی تۆی
تەقەت کردووم
هەمیشە کوانووم لە داگیرسانایەو
ئەوینم ناکوژێتەوە
**
ئەو بۆ من تەنها کتێبێك نییە
بە ڵکو هاودەمی هەمیشەی
هەموو ئەشقێکی دونیایە
بۆ هەر لایەك سەر هەڵگرم
وەك تارمایی لەگەڵمایە

# کتێبەکانم

1

هەموو ئێوارەیەك زۆربا

وەك شەباقەیێ لە نوور

وەك ڕووبارێ لە بخوور

لەناو تۆزی کتێبەکانم دێتە دەرەوە

وەك لە باخی بەی هاتبێ

دوای ئەوەی کە مەست مەست دەبێ

کەی مرۆڤ سەما فێر دەبێ؟

2

من بە بۆنی کتێب دەژیم

لەڕێی بۆنی کتێبەوە دانتیم ناسی و

سەفەرمان بۆ باڵا کردووە

هەر بەو بۆنەش چوومەوە سەر گۆڕی نالی

3

بۆ هەر کتێبێ دەنووشتێمەوە

یادەوەرییەك دەمکوژێ

هەر پەڕێ هەڵدەدەمەوە

ڕستەیێ ڕۆحم هەڵدەمژێ

4

کتێبێ هێندە لە گەڵیا خەوتووم

جار جار وەك ژن هاوار دەکات

داوای منداڵم لێ دەکات

5

کتێب هەیە ناوە ناوە لە دڵەوە کۆتم دەکا

کتێب هەیە دروستم دەکاو

وەك نووسین ئازادم دەکا

6

هەموو نیوە شەوانێك

کتێبێ لە بەرزایی ڕەفەکانەوە

بانگم دەکاو ورد ورد دڵم دەداتەوە

هەندێ جاریش وەك مەعشووقێ

دەخزێتە ناو باوەشم و

بێباکانە دوگمەکانی دەکاتەوە

7

کتێبێکم هەیە هەمیشە و بەردەوام

خەمبارو خەمگینە

ئەوە کتێبێ نیشتمانمە ئاڵ بووە

ئەوە کتێبی نیشتمانمە

لەتاو بێ ئەمەکی ڕۆڵەکانیدا لاڵ بووە

8

شەوانە درەنگ

گوێم لە ناڵەی کتێبێکە دەناڵێنێ

من دەزانم ئەوە کتێبی نالییە

لەتاو هیجرەت دەناڵێنێ

دڵنیایە نیشتمانە جێی دەهێڵێ

9

ئەو کتێبەی باوکم لە سەرە مەرگا کردییەوە

ئێستاش وەك خۆی کراوەیە

چەند دای دەخەم شەوانە خۆی دەبێتەوە

چی بکەم کتێب هەمیشە بۆ

عاشقی خۆی دەچێتەوە

10

کتێبی هەموو برادەرانم وەك گلێنە پاراستووە

هەندێ لەو کتێبانە دەڵێن فڕێماندەو هەڵمان مەگرە

کە خاوەنی حەرفەکانمان زۆر لەمێژە

ئێمەی لە ناو بێ ئومێدی جێ هێشتووە

11

زۆر جاران لە ناو کتێبخانەمدا وا هەست دەکەم

من برایەکی تاقانەی هەزاران هەزار خوشکم

12

من بە بۆنی کتێب نیشتمانی خۆم ناسییەوە
هەر بە بۆنی کتێبانیش دەیناسمەوە
هەر کاتێ کتێب نەمینێ
نیشتمان چەمکی نامینێ

13

هێندە دەستم بە گەردنی کتێبەکانمدا هێناوە
لێم ببورن ئەگەر بڵێم
هیچ جیاوازییان لە گەڵ کۆرپەکانمدا نەماوە

14

تەنها کتێب شایانی ئەوەیە
لە قورگی شێری دەربێنی

15

هەرکاتێ سەفەر بکەم
نیشتمان بە کتێب دەسپێرم
ئەگەر سەد ساڵیش نێمەوە
تەنها کتێبە دیاری منە
بۆ نیشتمانی بنێرم

## بەراورد

1

ئاسمان کتێبی زۆربایە

زەوی سەمای لێ فێر بووە

2

ڕێبوارەکان بۆ شیری ئاسمان دەچن

ژیانیش خۆی و جانتای پڕ ئاڵۆزیی

ئەوانی لە دامێنێکی تژی زەوی گیرکردووە

3

زەوی پەڕەکاغەزێکی سپییە

ئاسمان خۆی تیا دەنووسێتەوە

4

ئاسمان شمشێری دیمۆکلیسە

بەسەر گەردنی زەوییەوە

5

ئاسمان و زەوی دوو ئاون

یەکیان ساف و

یەکیان شێلووی ناو یەك چاون

6

کە ئاسمان وەك مناڵ دەگری

زەوی گوڵەگەنمەکان بانگ دەکا بۆ سەما

7

خوا لە ئاسمانە

شەیتان لە زەوی

8

پاییزان زەوی خەمگینە

ئاسمان بە پڕووشە دڵی دەداتەوە

9

ئاسمان ڕووبارێکی شینە

زەوی مەلەی تیا دەکات

10

کە زەوی هەست بە تەنهایی دەکات

ئاسمان بە تەتەری باران

نامەی بۆ دەنێرێ

11

هەمیشە بەسەر لەپی زەویەوە

پێکێ دووان ئاودیو دەکا

بۆ ئاسمانیش

جگەرێ نوێژ دادەگیرسێنێ

12

زەوی خرخاڵێکی شینە

لە پێی ئاسمان

13

ئاسمان شەرابێکی ئەبەدییە

سەری زەوی مەست کردووە

14

ئاسمان دڵێکی شکاوە

زەویش قۆچێکی شکاو

15

کە ئاسمان سگی پڕ دەبێ بە هەور

زەوی دەبێتە مامانی

16

زمانی ئاسمان بارانە

زمانی زەوی بومەلەرزە

17

خوا لە ئاسمان شاعیری کوشت

زەوی یاری بە تەرمەکەی دەکات

18

زەوی ماڵێکی تاریکە

ئاسمان نووری پێ دەبەخشێ

19

ئاو لە زەوی وەڕەس دەبێ

وەك هەڵم دەچێتە ئاسمان

بۆ وەی زەوی زوێر نەبێ

ئاسمان بە باران بۆی دەنێرێتەوە

20

کە گۆزەی ئاسمان دەشکێ

زەوی پڕ لە شەڕاب دەبێ

21

ژیان بە بێهوودەییەوە جوانە لەسەر زەوی

دەنا لە سورفڵی ڕوومەتی کچێ دەچێ

لەسەرەمەرگا گۆرانی بۆ ئاسمان بڵێ

22

خوا ئاسمانی بە مرۆڤ ڕەوا نەبینی

بۆیە تووڕی هەڵدایە سەر زەوی

23

دەرگای ئاسمان بکەنەوە

زەوی چۆل دەبێ

24

لە کەناری پیرۆزەیی ڕووبارێکا

لە وێنەی ئاسمان رادەمینێ

لە زەوی شەڕاب دابەش دەکا

25

ئاسمان کتێبێکی گەورەیە

زەوی زنجیری کردووە

26

سێ بەشی زەوی ئاوە

ئاسمان خۆی پێ جوان کردووە

27

ئاسمان هەمیشە زیوین بوو

زەوی شەوقی ڕەش کردەوە

28

ئاسمان دڵی هێندە نەرمە

جارجار وەکو مناڵ دەگری

بەڵام زەوی هێند دڵڕەقە

لە مانای گریە نازانێ

29

ئاسمان خوێنی نەبینیوە

بەڵام زەوی

خوێن بەری چاوی گرتووە

30

دڵی ئاسمان سپییە لە بەفر دەچێ

دڵی زەوی دووکەڵدانە
دووکەڵی ڕەشی لێ هەڵدەچێ
31
ئاسمان دەرگای نهێنییەکانە
زەوی کلیلی شکاوە
32
مرۆڤ لە زەوی پەشیمانە
بۆیە عەوداڵی ئاسمانە
33
ئاسمان گەردنێکی سپییە
زەوی شمشێرێکی ڕەش
34
کە ئاسمان پرچی دەکاتەوە
چاوی زەوی دەڵێی کلی تیاکراوە
35
ئاسمان و زەوی دوو خوشکن
یەکیان کتێبی بەهەشتە
ئەوی تریان کتێبی دۆزەخ
36
ئاسمان نامەیەکی نهێنییە
زەوی پۆستەبەرێکی دەمشڕ

37

ئاسمان شووشە عەترێکە

لە باخەڵی زەویدا شکاوە

38

ئاسمان زوو زوو خۆی دەگۆڕێ

جارێ سپی.. جارێ ڕەش

جارێ پەلکە زێڕینە

زەوی هەرگیز ناگۆڕێ

39

ئاسمان پرسیارێکی سەختە

زەوی وەڵامێکی ئاسان

40

ئاسمان ئاوێنەی جاویدە

زەوی خۆی لەبەریا دەشوات

41

ئاسمان گۆڕستانی ڕۆحە

زەوی گۆڕستانی جەستە

42

بەڵام هێشتا زەوی جوانە و هێشتاکە ئاڵ

زەوی پڕە لە ئەوین و

ئاسمان خەیاڵ

## تابووتێ لە کتێب

باوکم  لە نەوەی قەتێ بوو
لە کێڵگەکاندا دەژیاو
لە دەشتاییەکاندا مردووە
جل و بەرگی لە کاغەز بوو
دڵی لە نوور
کە دەستت لەدەستی دەنا
پەنجەکانی لەناو لەپت دەتوانەوە
دایکیشم لە گوندێکی دوور
براکانم هێندێ لە دەریاو بناران
هێندێکیشیان لە تەمتومانی کەناران
خوشکەکانیشم لە باکوور
ماڵێکمان هەبوو لە ترۆپکی چیا
ماڵێکیشمان لە دارستان
هەندێکمان لە ناو ڕەشماڵان لە دایك بووین
هەندێکیشمان لە گۆڕستان
جاری وابووە
سپێدە نانمان لە کوێستان خواردووە
ئێوارە لە گەرمیاندا بارو بارگەمان خستووە

باوکم هێندە سەیری ئاسمانی کردبوو
هەموو ئەستێرەکانی دەناسی
هێندەی دەشتاییی بڕی بوو
هەموو گوڵە گەنمەکان
لە پێشوازییا دەوەستان
هێندە بە ناو دارستانەکاندا ڕەت ببوو
قسەی لەگەڵ هەموو بایەکان کردبوو
هێندە بارانی بەسەردا باری بوو
ڕەنگی بارانی گرتبوو
هە میشە کتێبێکی لە بەر باخەڵیا دەنا
لە هەر شوێنێ لەسەر هەر بەردو کانییێ
لە هەر لێوارو بنارێ
دەگەیشتینە هەر تاولییێ
کتێبەکەی دەردەهێناو دەیخوێندەوە
دەچۆوە نێو نیشتمانی ئەبەدی خۆی
باوکم کە کتێبی دەبینی
هەموو دونیای لە بیر دەکرد
دواجار باوکم کتێب کوشتی
هەر بەکتێبەوە ناشتمان
بۆ هەر شوێنێ بارمان دەکرد
ئێسك و پروسکەکانیشمان دەخستە ناو کیسەیەك

ئەو شارو شارمان پێدەکرد
لە شیرازەی هەر کتێبێ
حیکمەتێکی دەنووسییەوە
لەسەر هەموو لاپەڕەیەك پرسیارێکی داڕشتووە
باوکم بە بۆنی کتێبان
دەیزانی کەی هەور دێ و باران دەبارێ
با لە کام لاوە هەڵدەکا
هەر بە بۆنی کتێبانیش
کۆچی خێلی ڕادەگرت و دەیزانی بەفر دادەکا
باوکم کتێب کووشتی ئەو ڕۆژەش کە شاردمانەوە
تەمتوومان بوو دوو کتێبمان کردە کێلی گۆڕەکەی و
بۆ یەکجاری دامانەوە دەست نیشتمان
ئێستاش ئەگەر ئەو درەختەی شیعر نەبێ
کە لەسەر گۆڕی شین بووە
کەس گۆڕەکەی ناناسێتەوە
جار جار سەری هەڵدەگرت و
دەیدایە ناو دەشت و کێوان
بە هەفتەو بە مانگ ون دەبوو
کاتێ کە دەگەڕایەوە
تۆورەگەیێ کتێبی لە گەڵ خۆی دەهێنایەوە
دایکم سەر لەبەری قورئانی لەبەر بوو

هێندەی ئەو کتێبە خوێندبۆوە
ڕەنگی ئاسمانی گرتبوو
دوا جار کە بینیم
لەسەر ئەو بەرماڵەی باوکم بەر لە سەد ساڵ
لە ماڵی خودای هێنا بوو
سەری بە قورئان کردبوو
دوا سورەتی دەخوێندەوە کە مردبوو
بە بیرم دێ هەمیشە کتێبەکانی باوکمی ڕیز دەکردو
لە تۆز پاکی دەکردنەوە
هەمیشە دەیگوت
لە سای کتێبەکانی باوکتان من هەزار مناڵم هەیە
هەزار گەنجینەی قارون و هەزاران گەوهەرم هەیە
ئەویشمان وەك قەددیسێ لە بخوور
لە ژێر درەختەکەی شیعر ناشت
ئێستاش بۆ هەر لایێ دەچم
بۆ هەر وڵاتێ سەر هەڵدەگرم
ئەو دوو گۆڕە وەك دوو ئاگر
وەك دوو دڵۆپێ لە نوور
وەك دوو درەختێ لە بخوور
لە گەڵما دێن

## ژمارەو ئاواز

دونیا ژمارەو ئاوازە
فیتاگۆرس

### ژمارە 1

تاك و تەنها وەك قەڵەمێكی ماندوو
لە تەلارێكی زۆر بەرزی هەزار چاوە
یادەوەری خۆی دەنووسێ و
لەسەر پێیە بچكۆڵەكەی خۆی وەستاوە
پاشاكان هەرەسیان هێناو، ئەو هەر ماوە

### ژمارە 11

لەو كاتەوە ئەو قەڵەمە هەر بە تەنها
بێ دۆست، بێ ئازیز، بێ هاوڕێ
سەیری باخە دوورەكانی دەكرد
وەڕسی گیانی شەڵاڵی ئاخ كردبوو
لەدواجارا چووە ناو كۆدی ڕەهایی

هاوڕێکەی خۆی دۆزییەوە
ڕزگاری کرد لە تەنهایی

**ژمارە 2**

کە ماندوو بوو سەری خۆی لە هەوران دەدا
لە داخان پشتی کۆماوە
ئێستا وەك درەختێکی شکاو
سەیری ئاسمانان ناکات و
نامەی باران ناکاتەوە
هەرگیز ئاوڕ لە جارانی ناداتەوە

**ژمارە 8**

دەتوانین بۆ ئەبەد لە باخی بازنەی ئەو
بوخلێینەوە و ماندوو نەبین
دەتوانین بە قەڵەمێکی چکۆڵە
بەسەر نەخشەی ئەم دوو سێوە
یاری بکەین بۆ تاهەتاش تەواو نەبین

## ژماره 13

دەزانم تۆ وەك كلكی تاووسی سپی
باق و بریقت گلێنەم پڕ لە جوانی دەكا
وەك گوڵەگەنمی بەر هەتاو
دونیا پڕ لە شایی دەكا
بەڵام كاتێ دەگەن بە تۆ
دەڵێی بە دوای كەسێ وێڵن
بازێكت بە سەرا دەدەن
بێ ڕەحمانە لە ناو هەموو ژمارەكان
تاك و تەنها جێت دەهێڵن

## ژماره 14

تۆ هاودەمی جوانەكانی هەموو دونیای
ببیە تەمەنی هەر كچێ
بازی بەخت بەسەر شانیەوە دەنیشێ
كاتێ مانگیش دەگا بە تۆ
درەختەكان شین دەبنەوە
زەوی لە ژێریا دەپیشێ

ژماره 7

تۆ حەوتەوانەو حەوت برای

تۆ حەوت شەوو هەم حەوت ڕۆژی

تۆ حەوت ڕۆژی شین و شایی

تۆ حەوت خوشك و تۆ حەوت چرای

دونیا بە تۆوە دەسووڕێ و مایەی بوونی

تۆ حەوت ڕۆژی دروست بوونی

ژماره 12

کە ڕەت دەبێ

چی فریشتەی سەر زەمین و ئاسمان هەیە

لە پاش کۆچی کۆتایی ئەودا مەست دەبێ

ئاسمان و زەوی دەگۆڕێ

تۆ هەم ماتەمی و هەم خۆشی

کە ڕەت دەبێ

شەوقێکی تر ئەم زەمینە دادەپۆشێ

## ژماره 1000

تۆ کڵۆ قەندی کوێستانی

لەسەر هەموو زمانێکی

بە تۆ دووری نێوان هەموو ئاشقەکان

دیار دەکرێ

هەر بەتۆشە کەوا مێژوو ئاودیو دەبێ و

لە ناو خوێنی خۆیا دەمرێ

## ژماره 9

درەختی ئارەزووی ژنەو

ڕەگی هەر وەك شووشەی خەونە

تۆ گەوهەری خوداوەندی

هەتا مانگیش نەخولێتەوەو نەگا بە تۆ

کەسێ چاوی ناکاتەوە بۆ ئەم کەونە

## ئاوازی با

یەکەم ئاواز کە بەرگوێی مرۆڤ کەوتووە

لە ناو بێشەی قامیشەڵاندا هاتووە

ئاوازی با دەنگی پڕ میهری نەوایە

پەرتی هەموو دونیا دەبێ

دڵی ئەبەد دەنەخشێنێ و

بە ناو ڕۆحمانا ڕەت دەبێ

## ئاوازی بوون

یەکەم ئاوازمان بە زیڕەی بوون چڕیوە
هەر بە چەقۆی ئەم زیڕەیەش
ناوکی ئەزەلمان بڕیوە

## ئاوازی گریان

بینیوتە شمشاڵ چۆن دەگری
گریان ئاوازی فیراقە

## ئاوازی مەرگ

مەرگ لە دۆزەخەوە هاتووە
بۆیە مرۆڤ شێوەن دەکا
ئەو ئاگرەی لە دوای مەرگ دادەگیرسێ
بە فرمێسك و ئەشك نەبێ خامۆش نابێ
بۆ تاهەتا دادەییسێ

## ئاوازی مەی

ئاوازێ لە مەیدا
نۆتەی خۆی دەنووسێ
کە مرۆڤ دەباتەوە ئەسڵی خۆی
تەمۆخی ناو ڕۆح و جەستە رادەماڵێ
چی لاولاوەی ئەشقە لە باڵای دەئاڵێ

## ئاوازی ئاشقان

ئاوازێ بە دونیا دەسووڕێ نابیستری
داستانی قسەیەکی خۆشە و ناگوترێ
کە کەوتە سەر زمان پەرتی دونیا دەبێ
ئاگرە لە ناو پووشی ڕۆحا هەڵدەبێ

## ئاوازی نەی

غوربەتێك لە ناخی ئینسانە ئەزەلی
برینێکی سەختە
نەژیان سارێژی دەکات و نەمردن
نەی دەنگی ئەو برینە سەختەیە

## ئاوازی تەمتومان

ئەو ڕۆژەی کە ون بووم لە باخی تەمتوومان
ئاوازێ ڕێگای بۆ کردمەوە
ئاوازی سەر بەفرو باران بوو
منی بردەوە نیشتیمان

## ئاوازی درەختان

خەمگینترین ئاوازێ لە زەوی
ئاوازی گەڵایە لە وەرین
بۆیە گشت پاییزێ
ئاوازێ ئەم کەونە دادەگرێ
ئاوازێکە دەڵێ ڕامەکە
هەموومان ڕادەبرین

## ئاشکرا

تۆگیای، دەزانم تۆ گیای

تۆ خەونی، دەزانم تۆ خەونی

گومانی، دەزانم گومانی

یەقینی، دەزانم تۆ یەقینی

بەڵام کە بیر دەکەمەوە

تۆ خەونی، گومانی

یەقینی یاخود گیای

هەر زوو دەزانم

تۆ بوونێکی بێ ئەنوای

## ناسینەوەی زیو

تۆ بوێرێکی لە ژن و ترسێکی لە پیاو
تۆ چەمکێکی لە ڕووباری ئەنەدۆڵ و
دڵۆپەیەکی لە ورمێ
تۆ خەونێکی لە دمدم و هەویرێکی لە ڕامبۆ
تۆ شەوێکی لە مۆدێرن و سەدەیەکی لە فۆلکلۆر
بە تیغی ئەمازۆن ئاو دراوی
جۆگەلەیەکی لە فۆلگا
بۆشکینی بە زرمەی شمشێر تیا کوژرا
ڕووبارێکی لە کێلەشین
تۆ پەڕێکی لە هەڵەمووت
لاسکێکی لە یاسەمین
ڕۆمانێکی تەنهای لە بۆدلێرو
شارێکی بچووکی لە قوستەنتین
تۆ دۆزەخیەکی لە کتێبی دانتی و
بەهەشتیێکی ونبووی لە میلتۆن
دواجار تۆ قومری سەربالّی
یەهودیێکی ئورشەلیمی

بەڵام منداڵێکی بە نازیی ئەی نازو تا
ببوورە تۆ پۆڕێکی تەریوەی ناو دڵی بازی
ئەو دڵە بپارێزە بڕۆ
ئاوڕ لە کەس مەدەوە
کە ئاوڕت دایەوە تەڵەسمی تۆ بە تاڵ دەبێ
لێکدانەوەم سەرچیغ دەڕواو
زمانی مانەوەت لە کتێبی ئەوین لاڵ دەبێ
تۆ هەمیشە ڕابکە و ڕابکە هەر ڕابکە
چونکە تۆ بە ڕاکردنەوە جوانی
ڕابکە هەر ڕابکە
تکایە ئاوڕ مەدەوە
هەموو ئەوانەی ئاوڕیان دایەوە
بۆ تاوێ گەیشتنە بەهەشت
بەڵام بۆ ئەبەد هاودەمی ئاگر بوون
هەموو ئەوانەیش کە بێ پەروا ئاوڕیان نەدایەوە
بۆ ئەبەد گەیشتنە دۆەخ
بەڵام بۆ ئەبەد هاودەمی خودابوون

## لەباتی سەدا

1

هەست بریتیە لە چاو

کە کوێرەکان بۆی دەگەڕێن

هەست بریتییە لە گوێ

کە کەڕەکان بۆی دەگەڕێن

هەست بریتییە لە زمان

کە لاڵەکان بۆی دەگەڕێن

2

تۆ نە هەی هەتا بتبینم

نەبانگت هەیە بتبیستم

نە دەبیستی تا بانگت کەم

لە باتی بوون تۆ وەهمی

لە باتی سەدا تۆ سیحری

لە باتی ناو تۆ هەم ئیلهامی هەم شیعری

3

هەندێ جار تۆ لە مانگ و خۆریش دوورتری

هەندێ جار تۆ لە ناو لەپم نزیکتری
هەندێ جار تۆ وەکو بازنەی
ئەوەندە بەدوات دەسووڕێمەوە
دەبم بە تۆپێکی بچووك
هەندێ جاریش وەك چوار گۆشەی
ئەوەندە بۆت دەشکێمەوە
دەبم بە شووشەیێ شکاو

4

هەندێ جاریش وەك لاکێشەی
هێندە لە ناوتا ڕادەکەم
دەبم بە دڵۆپێکی چکاو
دەست بە بیابانی مندا دەهێنی
دواجار تێدەگەم کە تۆ سفری
کۆتایی بە ڕستەی وجوودی من دێنی

## سلێمانی

1

سلێمانی، منارەیەك بوو لە هەتاو

درەختێ بوو لە مۆنادی شینی ئاقیق

سپێدەیەك بوو لە خوناو

با هات پرچی داهێنا

باران هات تەڕی کردەوە

بەفر هات سپی کردەوە

سوار هاتن ڕەشیان کردەوە

2

کتێبی شار دەکەمەوە

پیرۆزترین کتێبی خوایە

لە دەرگای شار دەدەمەوە

گەورەترین دەرگای دونیایە

3

سلێمانی، نامەوێ دارالمولکی بابان بی

من دەمەوێ تۆ ڕەونەقی جوانی و

هەم مەلەکوتی ئینسان بی

4

لە سەرشەقام چڵەدارێکم نووسییەوە

لە ڕەگەزی درەختی دەرگای سەرا بوو
کە دامگیرسان، هەڵمی مێژووی لێ هەڵدەسا
ورد ورد فرمێسکی هەڵدەڕژان
5
جاران لە شار کە گوڵە گەنمێ دەپشکووت
ڕێ ڕێ بۆنی دەگەیشتەوە چەمی وان
ئێستا گوڵجاڕیش دەپشکوێ
بۆنی ناگاتە کانێسکان
6
کە چوومەوە بۆ لای پیروەیسی ملکەندی
گەنجەکان باریان کردبوو
جگە لە شەوێکی درێژ
هیچم نەدی
7
سلێمانی کتێبێکە لە ڕووناکی
لەوەتەی دایانخستووە
شەیتان لە ناویا نووستووە
8
کتێبی پاك
دەستی پاك دەیکاتەوە
9

چوارباغ دەڵێی چوارچرایە
قازی ئاسا
لە چوارمێخەی خەمی نیشتمان درایە

10

کچەکانی سلێمانی
دەڵێی شەونمی سەر گیان
کە خۆر هەڵدێ دەتوێنەوە
سپێدانیش، خۆیان و مشتێ تریفە
بۆناو کتێبی مەحزونی شار دێنەوە

11

لە تووی مەلیك
میرەکانم بیر کەوتنەوە
لەبەر کەزی درێژو گەشی پەریخان
بریقەی زرمەی شمشێریان
دەگەیشتە تاقی ئاسمان
ئێستاش پەریخان هەر ماوە
خۆی لە تارا شاردۆتەوەو شانەی عاجی فڕێداوە
بە دیار تەونی هەڵوەشاوەی
میرنشینەکان وەستاوە

12

کوانێ ئەو چین و ماچینە ؟

شیعرێ لەدیوانی نالی

وەك تنۆكێ

بە سەر گەڵای

گۆڕستانی مامە یارەوە تکا بوو

گوتی بەر لەوەی بارکەم و جێیان هێڵم

لەمێژ بوو سوپا شکابوو

13

ئەوەی من هەستی پێدەکەم، دەینووسمەوە

ئاگرێکە لە شاباڵان تەکاندەدا

داوای فڕینم لێدەکا

14

ویستم بچم بۆ دەرگەزێن

سەرێ لە دەرگای زین بدەم

نە زین ئەو زینەی جاران بوو

نە مەم لەڕەنگی باران بوو

ئاشقانیش مات ومەلول

لە ژێر زناری ئەوینی، بە فێڕۆ چوویان

وەستا بوون

15

زەرگەتە دەڵێی کۆترە

لە نێو پیرۆزەی ئاسماندا

بە سەر بێچووی خەمی مێژوو، هەڵکورماوە
لەدەرگای هەرماڵێ دەدەی
تەنها مشتێ خۆڵەمێشی پەریخانی تیا ماوە
16
شەقامەکان، هەمووی هەر دەنگی شکانە
هەڵدانەوەی کوانووی برین
وردوخاشبوونی ئێسقانە
ئەوەی وەك باران دەبارێ
تەنها هاواری ئینسانە
17
کە لە پەنجەرەی ئەزمڕەوە
لە ناوشووشەی بەفری چیا
سەیری سلێمانیم دەکرد
مەل قەتار قەتار ڕەت دەبوون
مزگەوتەکەی شێخی گەورە
تاك و تەنها دەمایەوە
منارەکەی، سەری لە سامال دەردێناو
بۆ تابان دەچەمایەوە
18
ئێستا شار وەك جاران نییە و بێ نموودە
بێ هەیبەتی خەنجەرەکەی ناو پشتوێنی

شێخ مەحمودە

19

سلێمانی، دەزانم تۆ وەك قەقنەس وای

لە ئاسماندا، لە ناو خۆڵەمێشی خۆتدا

زیندوو دەبییەوە

تۆ لە ڕەگەزی کاژی

تەیری گول لە گەڵاتا ناژی

## هەموو شتەکان با دەیبا

1

چی بکەم باشە؟ تۆ هەبوون و نەبوونم بی

کێلگەی شەونم و شەوقم بی

چی بکەم باشە؟ من سێبەرو سایەی تۆ بم

تا بۆ ئەبەد، لە گەڵ تۆ بم

2

سەرەنجام، دەچینەوە سەر زەمزەمەی جاران

لەوێ سەرەو ژوور دەبینەوە

دەچینەوە لای یاران

لای دانتی، دەرگای کتێبی فیردەوسمان بۆ دەکاتەوە

دەچینەوە لای نالی

دەمانباتەوە ئەو حوجرەی

دروستی کردبوو لە باران

3

هەموو شتەکان دەشکێن

من و تۆ نەبێ ئەی جاویدانی

تۆ لە ئەوینی  من و من لە ئەوینی تۆ

دەبینی، هەموو ئەوانەی من نووسیومە

لە نێرفانادا مەست بووە

هەموو ئەوانەی ناتوانم بۆ تۆی بڵێم
لەبادا ئاسێ بووەو لە وەسەنیەتدا گیر بووە

4

تۆ جەستەیەك ئاقیقی
باوەشێ نوورو ڕووباری
تەوتەمی، لە هەموو پەرستگاکان دا هەی
لە هەموو مەیخانەکاندا ساقی و مەی
پێم بڵێ چیت؟ تەمتومانی یا باخی بەی

5

چەند سەرسامم دەمێ بای
دەمێ پووش و دەمێ ئاگر
دەمێ ئاوی دەمێ دوکەڵ
دەمێ باران و تەمتومان
ژەنینی بای هەندێ جاریش قەدێ گیای
دەمێ لە بنارەکاندا میوانی کەفرو بادەی
هەندێ جاریش لە کەڵیساکاندا مەریەمی
لای مەلەکان تاووسی و
لە ناو بتەکانیش ئاموون
بۆیە من لە هەزاران هەزار دۆخدا سەرخۆشم

6

هەرچیەك بۆ تۆی دەنووسم

دەبێتە مەل و باڵ دەگرێ

هەرچییەك بۆ تۆی دەڵێم با دەیبا

هەمیشە لە بەرامبەرما وەستاوی

دیاریش نی

هەمیشە جێم دەهێڵی

هەردوو چاوت داگیر کردووم

7

دڵنیام تۆ نیت

کەچی لە هەموو شوێنێکا هەیت

دڵنیام تۆ هەیت

کەچی لە هیچ شوێنێکا نیت

8

تۆ چەند دووری، هەر دەڵێی لەو سەری دونیای

چەند نزیکی هەر دەڵێی لەناو دڵمای

# لەنیوەی قەڵەمدا

1

باران بە زەوقی گیا دەبارێ

تۆش بە پێچەوانەی دڵی من

خۆر بە  دڵی گوڵەگەنم هەڵدێ

تۆش بێ دڵی من ئاوا دەبی

2

تۆ کە هێندە بەرز بفڕی

تازە پێی من بە زەوی ناکەوێتەوە

3

ئەو دڵەی بێ ئەوین دەنووسێ

لە نیوەی قەڵەمدا وشك دەبێ

4

تۆ نەخشی ناو دڵی منی

هەمیشە لە ڕەنگدانەوەی

من تەونی ناو دڵی تۆم

هەمیشە لە هەڵوەشانەوەم

5

تۆ ئەبەدی منی

لە رۆحی کورتخایەنما

من ساتە وەختی تۆم

لە ئەوینی ئەبەدیتا

6

من وەکو با بە هەموو لایەکدا هەڵدەکەم

کەچی جارێ ڕێم نەکەوتە دارستانت

من وەك ڕووبار بە هەموو لایەکدا ڕەت دەبم

بەڵام هەرگیز ناگەمەوە کەناری تۆ

7

ئەوە ئەوینی تۆیە

قەڵەمی تژی مانا کردووە

8

هەر لەو ڕۆژەوەی کەمەندی ئەوینی تۆ

گەردەنی منی دیل کردووە

چی شەونمە لە گیای زەینم کەوتووە

9

ئەو کاتەی دەمەوێ ئەوینت بنووسمەوە

حەرفێ لە سەرم نامینێ

قەڵەمم ئاگر دەگرێ

10

لەبەرامبەر هەموو درەختەکانا دەوەستم

دەزانم تۆ لە ناو هەموو گەڵاکانی

لەگەڵ هەموو ڕووبارەکانا ڕادەبرم

دەزانم تۆ لە ناو هەموو ڕووبارەکانی

11

من دەمەوێ

لە چوارچێوەی ئەوینی ئەبەدیت بگرم

تا بۆ ئەبەد ڕەها بی

ئاخر من بە دەستی خۆم

چەقۆی دیلی دەخەمە نێو باخی ئەستۆم

12

جوانی تۆ

لە هەموو تاشە بەردو کەڤرێکا خۆی دەنوێنێ

بۆیە زۆر جاران هەست دەکەم

تاشە بەردێکم لە تۆ

13

ناوی تۆ وەك مانا درێژ دەبێتەوە

منیش تادێ دێڕەکانم کورت دەبنەوە

14

تۆ چەند لە من گەورە دەبی

ئەوەندە من بچووك دەبمەوە

15

من و تۆ هەمیشە بە پێچەوانەی یەکترین

کە هەڵدەفڕی من ناچارم بنیشمەوە

کە دێی ناچارم بڕۆم

کە دەتگرمە باوەش دەتوێیتەوە

کە لە چاوما دروستت دەکەم

تۆ لە ڕۆحتا دەمڕوخێنێ

16

زەوی بەو هەموو گەورەییەوە

بەشی جوانییەکانت ناکات

لە داخا بچووك بۆتەوە

دەبێ دڵی من چی بەسەرهاتبێ

کە بەو بچووکی خۆیەوە

پەی بە هەموو جوانییەکانت بردبێ

17

جوانی تۆ  لە ناو ئاوەکاندایە دەزانم

دەبێ بەدوای هە موو ئاوەکاندا بچم

جوانی تۆ لە دارستانەکاندایە دەزانم

دەبێ هەموو دارستانەکان تەی بکەم

18

جوانی تۆ

لە هەموو بارانێکدایە دەزانم

دەبێ لەپم بۆ هەموو بارانەکان بکەمەوە

جوانی تۆ لە سیمای با دایە

دەبێ هەموو، ئاسمانەکان تەی بکەم

من چۆن تۆ بدۆزمەوە؟

## کەسێ لە تەمتوومان

1

کە با هەڵدەکا ئەوە تۆی

لەناو هەموو بایەکانداى

هەر دەڵێی ئاوێنەی جوانی

دەزانم تۆ لە گەڵ بایەکاندا بای

کراسی باکان لەبەر دەکەی

لەگەڵ ئاوەکاندا ئاوی

هەیبەتی زێ لەسەر دەکەی

2

کە باران دەبارێ ئەوە تۆی

لەناو هەموو بارانەکانداى

دەڵێی ڕۆشناییت

دەزانم تۆ لە گەڵ بارانەکاندا بارانی

شەلاڵی ڕۆحی باران بووی

لە گەڵ بایەکاندا بای

تێکەڵی گڤەی بایان بووی

3

که بەفر دادەکا ئەوە تۆی

لە ناو هەموو بەفرەکاندای

دەڵێی نووری

دەزانم تۆ لەگەڵ بەفرەکاندا بەفری

بۆنی پڕووشەت لە خۆت داوە

لەگەڵ بارانەکاندا بارانی

ڕۆشنیی ئاوت هێناوە

4

که با کپ دەبێ و دەچێتەوە ماڵی خۆی

منم تەنهاترین کەس، تەنها

که باران تەواو دەبێ و دەچێتەوە ئاسمان

منم خەمبارترین کەس، خەمبار

که بەفر دەوەستێ و دەگەڕێتەوە ناو هەوران

منم تەنهاترین ئینسان تەنها

5

لە ڕژانی ئاو سادەتر دەنووسم

لە مناڵ سادەتر قسە دەکەم

6

تۆ لە هەموو شوێنێ ئامادەی

لە هەمو شوێنێکیش ونی

7

هەموو دەنگەکان تۆی

ئەی تاقانە دەنگی من

هەموو ڕەنگەکان تۆی

ئەی تاقانە ڕەنگی من

8

من ناوی تۆم بە قەڵەمی با نووسیوە

هەواڵی تۆم لە تەتەری ڕێ پرسیوە

9

سپێدان هەتاوت بۆ ڕادەخەم

شەوانەیش تریفەی مانگ

10

هەموو شتەکان بۆنی تۆم بۆ دێنن

بەڵام ئاخ تخوبی ڕۆح دەبەزێنن

## گەمەی ئاگرو ئەوین و کتێبان

1

ئاگرو کتێب و ئەوینم

هەریەکەو لە مەملەکەتێکەوە هاتووە

دەچنەوە سەر بڵێسەو نوور

سەر بە ڕەگەزی سووتانن

هەریەکەو لە تەڵەزمێکەوە هاتووە

بەسەر کوانووی ئەویندارانەدا ڕەت بووە

هەریەکەو بە ئاوازێ

لەناو دڵی جاویدانیدا پەرت بووە

2

ئاگرو کتێب و ئەوین

هەریەکەو لە شەرابێکی نووشیوە

لەناو کووپەی تەمتوماندا

چەمکی بوونی خواردۆتەوە

هەریەکەو وەك فریشتەیێ

چەندین ڕازی خوداوەندی

لەناو پەڕو باڵەکانی شاردۆتەوە

3

ئاگرو کتێب و ئەوینم

دۆستی دێرینی یەکترین

بەڵام هەرگیز ناگەن بەیەك

تاقە ڕازێ بۆ یەکتری نادرکێنن

یەك لەسەر زمانی پشکۆ

یەکیان لەسەر پشتی کاغەز

ئەوی تریان لەناو دڵدا

ئەبەدی خۆیان دەخوێنن

4

ئەوین و ئاگرو کتێب

هیچ گۆرانیەك بۆ یەك ناڵێن

بۆ ماڵی یەکتر ناچنەوە

کاتێکیش کە بەیەك دەگەن

وەکو ماری ئاشقەو ماشقە تێکدەئاڵێن

قەت لەیەکتری نابنەوە

5

ئەوین سۆمای چاوی دادێ

لە حەسرەتدا دەکوژێتەوە

ئاگر کڵو کۆی دەکەوێو

بۆ تائەبەد دەکوژێتەوە

که کتێبیش لەناو دەستی بەدکاراندا دەکرێتەوە
هەر دێڕەو دێری پێشەوە دەسڕێتەوە

6

ئاگر کتێب دەسووتێنێ
وەك چۆن ئەوین
هەموو دڵمی سووتاندووە
کتێب ئاگر خامۆش دەکا
وەك چۆن ئەوین دڵی منی داییساندووە

7

کتێبەکان پڕن لە ئاگر
ئاخ کتێبەکان کوانووی گڕن
ئاگرەکان پڕن لە کتێب
ئاخ ئاگرەکان کوانووی کتێبن
ئەوین پڕە لە جریوە
ئاخ ئەوین کوانووی خەمە

8

لە بڵێسەی ئاگرێکا سەدان کتێبم بینیوە
باس لە تەونی ئەوین دەکا
لە هاڵاوی کتێبێکدا سەدان ئاگرم بینیوە
شەڕابی ئەوین دەخواتەوە

9

ئەوین پڕە لە ئەفسانە

دونیا گەش گەش دەکاتەوە

کتێب پڕە لە وشە، دونیا سپی دەکاتەوە

ئاگر پڕە لەپشکۆ

دونیا ڕەش ڕەش دەکاتەوە

10

ئەوین دڵی برینداری ئەویندااران دەداتەوە

کتێب خواروخێچی زەین ڕاست دەکاتەوە

ئاگر ڕاستییەکان خوار دەکاتەوە..

11

کتێب گوتی بمکەرەوە

ئەوێنێکت پێ دەبەخشم پاكو سپی

ئاگر گوتی دامگیرسێنە

کتێبێکت بۆ دەنەخشم ڕەش وەك خەڵوز

ئەوین وتی بمگێڕەوە

زەنوێرێکت پیشان دەدەم پڕ لە ئەشق

12

کتێب و ئاگر دوو دۆستن

تائێستا یەکتر ناناسن

سەڵاو لەیەکتری ناکەن، تەنها دڵی یەکتر دەبەن

کتێب و ئاگر دوژمنن
هەمیشە دەست لە ملی یەکتر دەکەن
ئەوین دەرگا لە هەردووکیان دەکاتەوە

13

ئاگر هەمیشە
حەکایەتی فەنا بوونی کتێب دەگێڕێتەوە
کتێب هەمیشە
حەکایەتی داگیرسانی ئاگر دەنووسێتەوە
ئەوین هەمیشە
حەکایەتی تەنها بوونی ئاشقان دەبێژێتەوە

14

ئەی ئاگر تۆ لە داگیرسانی کتێبدا وەستای
خزمی دووکەڵ و خۆڵەمێشی
ئەی کتێب تۆ لە کوژانەوەی ئاگردا ئاوی
لە بنەچەو ڕەگی گەڵای

15

ئەی ئاگر تۆ داگیرسانت هەیەو
هەڵقرچانیش دەنگی تۆیە
ئەی کتێب تۆ شەوقت هەیە
ڕووناکی ڕەنگی تۆیە
ئەی ئەوین تۆش سووتانت هەیە

داستانەکان جەنگی تۆیە

16

ئاگر نە زمانی هەیە نە وشە

نەڕستەی هەیە نە دیوان

ئەوین هەزاران زمان و سەدان ڕستە

ئاگر کتێبان دەنووسێ و دەسووتێنێ

کتێب ئاخ کتێب

هەمیشە ئاگرو ئەوین دادەگیرسینێ

17

هەموو کتێبەکان وەك یەکن دەڵێی بران

هەموو ئەویندارەکان ڕووناهین دەڵێی چران

هەموو ئاگرەکان جیاوازن لە داگیرسان

18

کتێبەکان بەڕەگەز سەر بە کڵۆکۆی ئاگرن

بۆیە هەمیشە

بە بۆنی دووکەڵ و ئەوین سەرخۆشن

ئاگرەکان بەڕەگەز سەر بە ئەوینی کتێبن

بۆیە هەمیشە خۆیان بە کڵپە دادەپۆشن

19

ئەوکاتەی با تەڵە ئاگرێکی هێنا

کتێبی کەونی داگیرسان

ئەوکاتەی با پەڕە کتێبێکی هێنا

ئاگری ئەوینی کردەوە

ئەوکاتەی با ئەوینی هێنا

هەموو ئەویندارەکانی

بۆ ناو تەنهایی بردەوە

20

کە دووکەڵ لە کتێب هەڵدەسێ

ئاگرەکان خامۆش دەبن و دەکوژێنەوە

کە وشە لە ئاگر هەڵدەچێ

کتێبەکان دادەگیرسێن

وەك عەتر دەپژێنەوە

کە حەسرەت لە ئەوین هەڵدەسێ

ڕێ و ڕەچەڵەکی ئاشقان دەبڕێنەوە

21

ئەی ئاگر تۆ کتێب کوژی

کتێبیش پڕی ئەوینە

ئەی کتێب تۆ ئاگرمژی

ئاگریش سەرەتای فڕینە

ئەی ئەوین

تۆش هەم ئاگرو هەم کتێبی

## هەمدیس ئەوە تۆی ؟

1

هەموو سپێدەیەك

قسە ڕژاوەکانت کۆ دەکەمەوە

کە وەکو زێ دەڕژێنە

دوورترین خەڵوەتی ڕۆحم

زەوییان پڕ کردووە لە ئاقیق

ئاسمان لە نوور

فەلەك لە سووڕانەوەی بێ سنوور

2

هەموو نیوەڕۆیێ

جوانییەکانت دەنووسمەوە

کە دەڕژێنە دوورترین ماڵی تەنهاییم

تەونی بوونیان کردووە بە ئاو

شەوەزەنگیان کردووە بە تیشك

تیشکی هەزار ڕەنگی هەتاو

3

هەموو ئێوارەیێ

ئاماژەکانت دەخوێنمەوە

کەڕاڤەی دوورترین

زێماری ئەوینم دەکەن
دڵیان پڕ کردووم لە گومان
بوونەتە دەقی سیحراوی
کتێبی سپی ناو تەمتومان
4
ئۆف ئۆف قسەکانت قسە نین
سروشی خوداوەندین، بەسەرما دادەبارن
جوانییەکانت جوانی نین
ئایەتەکانی ئاسمانن
لە کتێبی بوونی مندا ئاگر دەگرن
ئاماژەکانت ئاماژە نین ڕاڤەی زمانی زناکن
لە نووکی قەڵەم هەڵدەفڕن
5
هەموو ڕۆژێ
حیکمەتەکانت دادەڕێژم
کە پەندی مانەوەن
هەموو هەفتەیێ
وێنەکانت دەشۆمەوە
کە وێنەی ڕەهایین
هەموو مانگێ
بوونت لە ڕۆحما دەبێژم

که بۆمن مایەی تەنهایین

6

حیکمەتەکانت جوانی ئاوە

ئۆف  ئۆف هەمیشە لە مندا چك دەکەن

بوونت بایە، لە دارستانی دڵی مندا هەڵدەکا

وێنەکانت مەجازی خودایە

دەرگای گوزارشت لە زمانم دادەخەن

7

شەوق و نوورت لافاو دەکاو دەیبەشمەوە

ئەوانە شەوق نین

دەستێکە بوونم ڕادەگرێ

وەهمێکی دوورە

لەسەر دەستی گومان دەمرێ

8

بۆ ئەبەد لە دەرگای سۆراغت دەدەم

دەچمەوە ناو کوختەکەی خۆم

کوختەی سادەو شیعری گریاو

دەزانم شتێ نیم جگە لە خۆم

لە خودی خۆم

9

سپێدان قسەکانت وردوخاش دەکەم

ئەوە وەهمە

درۆ لەگەڵ خۆمدا دەکەم

نیوەڕۆیان

جوانییەکانت دەدەم بە خۆر

ئەوە ڕاستییە تا بگەم بە تۆ

ئێوارانیش

ئاماژەکان بەتاڵ دەکەمەوە

ئەوەیان مەحاڵە

ئاماژەی ئەوین تەڵەسمە

10

من لەمێژە خۆم داوەتە دەستی عەدەم

ئەوە ڕاستییەکە نایشارمەوە

بەڵام کە وێنەکانت دەسووتێنم

ئەوە دڵمە وردوخاشی دەکەم

11

دەمەوێ کۆتایی بە شەوقت بێنم

مەرگی خۆمە ڕایدەگەێنم

نیازمە خۆم بکوژم

فەرمایشتی ئەوینی تۆیە، بە جێی دێنم

12

بەڵام کە قەڵەم

لە نووسینەوەی تۆدا هەڵدەگرم

هەموو سپێدە و مانگ و ساڵەکان

دەبنە ساتێکی کورت

لە زماندا دەتوێنەوە

بۆ دووبارە لە دڵمدا دەڕوێنەوە

ئەوە تۆی هەمدیس ئەبەدی من

## ئیدی تەواو

1

بڵێ چۆن

ئەی خۆری من ڕزگارم دەبێ؟

ئارەزووی ئەبەدی منە پرسیار دەکەم

کە دەزانم هەرگیز پرسیار دادم نادا

هەمیشە خۆم وەڵام دەدەمەوە

کەدەزانم وەڵام تاقە ڕێگایەکیش

نیشانی من نادا

2

بۆ هەر کوێ دەڕۆم هەرتۆی

سەیری دواوە دەکەم هەر تۆی

سەیری ئاسمان دەکەم هەرتۆی

سەیری ئاوەکان دەکەم هەر تۆی

3

شوێنێ لە دڵم نەماوە

هەموویت پڕکردۆتەوە

تەنانەت بەسەر دار و درەختەکانیشەوەی

بەسەر ڕووبارو زێ و جۆگەلەکانیشەوەی

لەسەر هەموو منارکانی
لەسەر هەموو هەورەکانی

4

لەناو ئاوەکان مەلە دەکەی
لە ئاسماندا مەلی و دەفڕی
لە دارستانەکان بای هەڵدەکەی
لە شاخەکان بارانی و دەباری
لە دۆڵەکانیشا سوولی هەڵدەڕژێی

5

لە مزگەوتەکاندا نوێژی
لە کەلێساکاندا مەریەمی
لە مەیخانەکانا ساقی
لە ناو کتێبەکاندا
ڕستەی ئەبەدی
لە ناو دڵی نۆتەکاندا ئاوازی
پێم بڵێ تۆ کێی؟

6

تازە تۆ لە دەرگای خوێنت داوە
تۆ وەك با، وەك نوور
وەك باخی بەهێ و وەك زێ
گەماڕۆی ئەبەدی منت داوە

7

کەدەمەوێ دوو باڵم هەبێ

تۆ لە ناو باڵەکانی

کەدەمەوێ هەڵفڕم و دوور دوور بڕۆم

تۆ لە ناو هەور و ئاسمانەکانی

کەدەمەوێ بچمەوە ژێرخاك

شکاتی خۆم بەرم بۆ خوا

تۆ لە گەڵ هەموو فریشتەکانی

8

تۆ تاکی لە زمان

یا

کۆی لە گومان؟

ئاوا منت داوەتە دەست

شەوقی لوتکەو پاچی زەمان

## بوەستە

1

فرێم مەدە من شت نیم
من بەهاو ڕەهای گەردوونم
من بۆ خۆم ڕستەی نێو دەقێکی
فرێدراوی بوونم
من بۆ خۆم کتێبێکی گەورەی
هەڵگیرسان و لە ناو چوونم

2

فرێم مەدە
بەس تەنها ئەمڕۆکە و سپێدە ڕامگرە
بەیانی دەزانی
دەقی من چەند کەسی
وەکو تۆی هێناوە
دارستانێکی چەند چڕە

3

تەواوی تەمەنم دا بە تۆ
ژیان و بوون و مان
پەیوەندیم ، کە سێتیم
زۆر جاران تا سنووری مردن

بەدوای تۆدا هەڵەمووتی مەحاڵم بڕیوە
تیری زۆر ڕاوچیان لە گیانم تەنیوە
یەك شتم بۆ ماوە
ئەویشیان شیعرێکە
بە تەنها لە ڕۆحم جێماوە
گەشترین تیشکی هەتاوە
4
تازە من تەواو بووم
هیچ وەسفێکی نەماوە
من نەیکەم بە باڵانومای جوانیت
بۆیە زۆر جاران وەهمێکی تەمزمان
ئەو ڕۆحەم دادەگرێ
وەهمێکە پێم دەڵێ کە تۆ نیت
ئاخ من مرۆڤێکی چەند ماندووم
ئەی لوتکە و بنارم
ڕەنجێکی بێهودەو خەسارم
5
تازە چۆن بێمەوە سەرەتاو
بێمەوە سەر یەکەم بینینت
چۆن چاوم بە یەکەم فرمێسك شۆمەوە
چۆن وەك یەکەم جار ئەو دڵەم داخورپێ

دەمەوێ وەك جاران

نە بام دیبێ و نەباران

نە بە دوات چووبێتمە ناو شاران

نە ڕۆژێ ئەتۆم ناسیبێ

نەڕۆژێ بە تۆم زانیبێ

نەبزانم کە تۆ هەبووی

بچمەوە جارانم

6

بەڵام ئاخ  تازە دڵ لە دڵ ترازاوە

ئەو داخە بە کێ ڕەش دەبێتەوە

کە ئاگر لە پووش بەربێ

تازە بە کێ دەکوژێتەوە

من تازە چۆن دەبمەوە خۆم

کە تۆ هەمووت داگیر کردووم

من چۆن زیندوو دەبمەوە

کە لە مێژ سایە من لە تۆدا مردووم؟

## ئارەزوێکی سادە

سوورانەوەیەك بەسە
پەی بە هەموو سەمایەکانت ببەم
وەستانێك بەسە
هەموو ڕۆیشتنەکانت ئاشکراکەم
درەختێ بەسە
هەموو دارستانەکانت بدۆزمەوە
جۆگەلەیێ بەسە ڕووبارەکانت ببینم
گوڵە گەنمێ بەسە کێڵگەکانت بناسمەوە
تاقە ڕەشماڵێ بەسە
تاولی هەموو کوێستانانت
بەسەر ڕۆحما ببەشمەوە

## پەیمانە

1

سادەیی گوڵ نییە بیچنی

سادەیی دڵ نییە تۆ ورد و خاشی کەیت

سادەیی پەیمانەی شەرابە

کە نات بە لێوتەوە

خۆخی ڕۆحت دەگرێ

بۆ ئەبەد دەبیە دیلی دەستی ڕەهایی

سادەیی مەستییە

2

وەرەوە ئێستاکەش وەستاوم

کتێبێکی تەنهای ناو ڕەفەم

بارانێکی وردی ئاسمانم

درەختێکی تەنهای بیابانم

لوتکەیەکی بەفراوی چیام

کەروێشکەیەکی خەمگینی

ناو پاوانێ تژی گیام

## له ئاقیق درەنگتر

1

من کە ڕۆژ ڕووناك و پڕ لە ڕووناهییە
پەیوەندیم بە خۆرەوە نییە
ئەوە تۆی تیشك دەبەخشی بە ڕۆحم
من کە شەو تاریکە و تژی تەناهییە
پەیوەندیم بە شەوەوە نییە
ئەوە دووریتە تاری دەبەخشێ بەچاوم
من کە ڕووبار مشت شەپۆلە
پەیوەندیم بە ڕووبارەوە نییە
ئەوە تۆی
وەکو هاژە هەڵدەڕژێیتە ناو هەناوم

2

من ڕۆژ بە ئەشقی دڵم دەپێوم
شەو بە ناڵینەوە بانگ دەکەم
ڕووبار بە سووتانمەوە دەناسم

3

ئێواران کە گۆرانی دەڵێم
ئەوە گۆرانی نییە
هەراسانی نەخشەی زەینە

شەوانە کە مەست دەبم
ئەوە مەستی نییە
دروست کردنەوەی خەونمە
بەیانییان کە بەسەر زەویەوە دەڕۆم
ئەوە پیاسە نییە
ژەهری تەنیاییە بەناو خوێنمدا دەسووڕێ
کە گۆرانی دەڵێم
ئەوە خوێنمە فوارە دەکات

## سەرەتاکان

سەیرکە هەموو شتێ دەگەڕێتەوە جانگی خۆی
هەموو شتێ دەست بەبوونی خۆی دەگرێت و
دەگەڕێتەوە یەکەمین بانگی خۆی
مانگ نووری خۆی
بە هەموو زەمین دەبەخشێ
کە ماندوو بێت ئاوا دەبێ
هێور هێور دەگەڕێتەوە جێگای خۆی
خۆر دونیا پڕ ئاور دەکا
کە باڵەکانی شل دەبێ دەگەڕێتەوە ڕێگای خۆی
مەل بە هێزی باڵەکانی
لەو ئاسمانە بەرینەدا وەڕەز دەبێ
دەچێتەوە ناو لانەی خۆی
مێرووله چەند بچووکە
لە هەموو شوێنێ جێی دەبێتەوە
بەڵام زەوی تووڕ هەڵدەداو
ڕادەکاتەوە شانەی خۆی
تاووس ئەو هەموو جوانییەی خۆی
لەدونیا دەشارێتەوەو
دەچێتەوە ناو پەڕی خۆی

من و تۆ نەبین ئەی دۆست

قەدەر بە پێچەوانە دایڕشتووین

ئەگەر من بچمەوە ئاسمان

تۆ دەچییەوە قووڵایی زەوی

من ئەگەر ئاگربم تۆ ئاوی

یا من لە تاریکی بۆت بگەڕێم

ئەوە تۆ لە ناو ڕۆحی هەتاوی

## سەدەف

سەدەفی ئەوینی تۆ دەریای سپی کردووە
سەدەفی ئەوینی تۆ ژەهری شیرین کردووە
سەدەفی ئەوینی تۆ ڕستەی پڕ مانا کردووە
بەڵام دڵی منی وەکو نەی کون کون کردووە

## تەمێك لە زیو

تەمێك هەمیشە دامدەپۆشێ
تەمێك هەمیشە بەسەرما ڕەت دەبێ
تەمێك هەمیشە لەمن نزیك دەکەوێتەوە
تەمێك هەمیشە لەمن بە دوور دەکەوێتەوە
ئەو تەمە تۆی کە دڵنیام
بۆ ئەبەد لەناویا وندەبم

## شکانی گۆزەیێ

دەترسم من تەواو دەترسم
لە کەوتنم ، لە ڕمانم
دەترسم من تەواو دەترسم
لە زەمان و لە زمانم
کەوتن و ڕمانم
زمان و زەمانم
هەموو لە کتێبی ئەوینی تۆدایە
کتێبێ لە دەستی پڕ میهری خودایە

## قوڕی خەیاڵ

گەوهەرەکان لە قووڵایی دەریادا دەبریسکێنەوە
مەلەکان سەف بە سەف
لە قووڵایی ئاسمان هەڵدەفڕن
بەڵام کانەکانی ئەوینی پڕ سکڵ و بڵێسەت
بەتەنها و بە تەنها لە ناخی مندایە
ئەی ئازادی بێ سنووری من
ئەی فراوانترین زیندانی من

## کەسێك بە تەنها

لەناو هەموو دەنگەکانی ئەو فەزایە
من دەنگی تۆ دەناسمەوە
لە ناو هەموو ڕەنگەکانی ئەم دونیایە
من ڕەنگی تۆ دەناسمەوە
تەنها دەنگی تۆیە لە غەیبەوە دێ
تەنها ڕەنگی تۆیە لە شەبەیخوونەوە دێ

# هەنگوینی هەڵەمووت

کە بیر لە تۆ دەکەمەوە
یەکجار دڵنیام مەحاڵی
بەڵام تەنها ئەوینی مەحاڵ ئەوینە
ئەگینا تروسکەیەکی گەرم و دەمدەمی
ناو کووپەی دڵێکی خەمگینە

## دەریا لە گۆزەیێ

هەندێ جار لە ڕەوەی مەلاندا بانگم دەکەی
دەڵێم ئەوە تۆی بە ڕەگەز فڕندەی
هەندێ جاریش لە ناو ئاوەکان
دەڵێم ئەوە تۆی لە تەباری ئاوی
هەندێجاریش لە دارستانەکاندا بانگم دەکەی
دەڵێم ئەوە تۆی لە ئەزەلەوە بای
ئاخ کە تۆ ئاو و با و فڕینی
ئەو دڵەم چۆن بەشی تۆ دەکات ؟

## لە شینی دووباڵدا

لە پەنجەرەوە دەتبینم لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی
لە شەپۆلەکان دەتبینم لە قووڵایی دەریاکانی
لە بایەکاندا دەتبینم لە گێژەنی زەریاکانی
لە کتێبێ دەتخوێنمەوە کە لە کۆتایی دونیایە
ئاخ تۆ، هەمیشە لە شوێنە دوورەکانی، خودایە

## سووتماك

من هەمیشە مەستی تۆم
ئەی ڕوونتر لە زوڵاڵی ئاو
هەموو ئاگاهییەكانت لە من سەندووە
نە زمانم دەگەڕێ نە چاو
نە دڵم بە دونیا ماوە
چونكە تەواوی بوونی خۆم
لەڕێی تۆ داناوە

## ڕەهایی

شوێنە دوورەكان چەند خۆشن
تۆ هەمیشە لە شوێنە دوورەكانی
بۆیە هەمیشە دەمەوێ دوور بڕۆم دوور
ئای چەند ڕقم لە لەمپەرەكانی زەوییە

## فەنابوون

سپێدان سەما دەکەم نازانم بۆ
ئێواران سەما دەکەم نازانم بۆ
شەوان سەما دەکەم نازانم بۆ
بەڵام لێم ڕوونەو دەزانم
ئەوە سەرەتای ئاوێتە بوونمە لە تۆ

## ئێستەتیک

دەچمەوە لێوارەکانی دەریا هەرتۆ دەبینم
دەچمەوە دارستانەکان هەرتۆ دەبینم
دەچمەوە ڕابردوو
دەچمەوە ئایندە هەرتۆ دەبینم
تۆ یەکسان بوویت لەگەڵ کەون

## کوژران

هەموو فەلەکی خۆم
لە چاوو لەزمان و لە گوێ
بە تەنها بۆ تۆ تەرخان کردووە
من بە وەژدی هەزار چەشنەی تۆپێکراوم
بۆیە من فڕم بە زەمینەوە نەماوە
وەك مەملەکەتێکی خامۆش
بە شەبەیخوونی ئەوینت داگیرکراوم

## ئاقیقی شکاو

هەموو ڕۆژێ دەنگی تۆ لە پەیوارەوە دێ
هەموو ڕۆژێ رەنگی تۆ لە خۆرەوە دێ
بەڵام ئاخ ئەوینت زیندانی کردووم
نە پەنجەرەیەکم هەیە کۆتی تیا بشکێنم
نە جێگەیەکم هەیە نە ڕێ
چۆن غەیب و خۆر لێکدەمەوە؟

## زوله‌یخا

ئێستا عه‌تری تۆ ئاوی جاویدانییه
هه‌موو عه‌تره‌كانی شووشتۆته‌وه
ئێستا ده‌ستی تۆ ستوونی بوونه
كه‌ونی ڕاگرتووه
ئێستا ئه‌وینی تۆ ئه‌وینی ئه‌به‌دییه
هه‌موو ئه‌وینه‌كانی دیكه‌ی داگرتووه

## شه‌وقێ له یاخسه‌مه‌ره‌وه

من هه‌ورێكی سپی چه‌ند ته‌نهام
وه‌ك كه‌سێ به ته‌نها له قووڵایی ئاسمان
چاوه‌ڕوانی ده‌ستی پڕ میهری با ده‌كه‌م
هه‌ڵكات و بمكاته ڕێژنه‌یێ له باران
من ئه‌سپێكی سپی چه‌ند ته‌نهام
وه‌ك كه‌سێ به ته‌نها له قووڵایی بیابان
چاوه‌ڕوانی زینی زیوینی تۆ ده‌كه‌م
بچینه‌وه ناو ته‌شقی ئه‌رخه‌وانی جاران

## دواجار

هەموو شتێ ڕێگەیەکی هەیە بۆ شوێنی خۆی
عەتر بۆ پژان کە جوانی کەون دادەگرێ
ژەهر بۆ ڕژان کە درەختی ئەوین سیس دەبێ
تۆش بۆ باوەشم کە ڕۆحم گوڵ دەگرێ

## فۆبیای ئاوێنە

تۆ وەك ئاوێنە وای
تەواوی شکستەکانی دڵی خۆمی تیا دەبینم
تۆ وەك باران وای
تەواوی کێڵگە تینووەکانی خۆمی تیا دەبینم

## گەمارۆی ئەبەدی

ئەوینی من وەکو با
بە هەموو شوێنێ هەڵدەکاو دەورت دەدا
دووری تۆش وەکو ئاو
لە هەموو شوێنێ هەڵدەڕژێ و لوولم دەدا

## دیلبوون لە ئەوین

هەموو شتێ لەم کەونەدا بێ پەروا دەسووڕێتەوە
تەنها منم لە مەداری تۆدا زیندانیم
لە زەوی گیرت کردووم و
بە ئاسمان دەسووڕێیتەوە

## هاودژ

من لە ڕابردووەکانەوە بۆ تۆ دێم
تۆش لە ئایندەوە
تۆ ئەفسانەی لە بەر چاوم
من حەقیقەت
سەیرکە چ مەجازێ لوولی داوم

## یەکتربڕ

تۆ لە ماسی دەچی
ئەوینی منیش لە دەریا
دەریا چەند قووڵ بێ
خنکانی تیا خۆشتر دەبێت
ڕێگەی منیش بەرەو تۆ
دوورترو دوورتر دەبێت

## بوونێکی وێران

تادێ لە تۆدا ون دەبم و دونیام بچووك دەبێتەوە
تادێ لە مندا ئاشکرا دەبی و دونیات گەورە دەبێتەوە
لە میانی ونبوونی من و ئاشکرابوونی تۆ
ڕۆح بەرەو ئاسمان هەڵدەچێ و نایەتەوە

## دژبەندی

ئەوین تۆی کردۆتە ئاوو
منیشی کردووە بە ئاگر
ئەوینی ڕاستەقینە، مەحاڵ دروست دەکات
ئاگرو ئاو پێکەوە هەڵناکەن

## شکانەوە

بڕوانە هەموو شتەکان بەیەکەوە بەندن
من و تۆ نەبێ لە ئەزەلەوە لەیەك دابڕاوین
سەیرکە هەموو شتەکان تا ئەبەد دەنووسرێنەوە
من و تۆ نەبێ لەتەختەی بوون
ڕۆژانە ڕەش دەکرێینەوە

## نەی گریا

تۆ عەتری لە پژان
من ژەهرم لە ڕژان
عەتری تۆ جوانی
ژەهری من فیراق

## کەونار

دەزانم گەیشتنم بە تۆ
وەهم و ئەفسانەیە
نەگەیشتنم حەقیقەت
چی بکەم؟
بوەستم یا هەمیشە بەدوات ڕابکەم
تۆ چەند سەختی دەوڵەتی من

## تاشینی بەرد

بگەم بە تۆ ون دەبی
نەگەم بە تۆ ون دەبم
لەنێوان دوو ونبوونی ئاوا مەینەتبار
ئاسکێکم لە تەونی ڕۆژگاردا
ڕابکەم دەدێرێم هەر پارچەم دەکەوتە بنارێ
ڕانەکەم گوللەی ڕاوچی ئەوین
هەناوم دەهاڕێ

## سیزیف وەك ئاشق

من بە فرمێسکی ڕژاوم
ئەفسانەی ئەوینی تۆ دەنووسمەوە
تۆ بە بازرقەی خوێنی من
تەونی جوانییەکانت دەنەخشێنی
من هەمیشە تۆ بەرەو جاویدانی دەبەم
دەشزانم نەدەکەوم ونەدەگەم

## هەوەسی مانەوە

ئەی کیشوەری ئەوینی من
ئایا تۆ منی یا من تۆم
یا هەردووکمان بەردێکین لە ژێر گۆم ؟
بەرەو یەك هەنگاومان هەڵدێنین
یا بۆ خۆر ڕادەکەین ؟
کۆتایی بەخۆمان دەهێنین

## ئاشكرابوون

ئەو ڕۆژە بەرامبەر دەریایێ وەستام و سەیرم كرد
ئاو،شەپۆل ، ماسییەكان، هەرتۆ بووی
كە سەیری وشكاییەكانم كرد
خاك و خۆڵ، شاخ و دۆڵ هەر تۆ بووی
كەسەیری دارستانەكانم كرد
گەڵاو گوڵ ، دەنگی نەی
مەل و چڵ هەرتۆ بووی
كەسەیری خۆمم كرد هەرتۆ بووم
زانیم من وەهمم و بەتەنیا هەرتۆ هەی

## نێوانی ئەبەدیی

بگەم بە تۆ هێزی ئەوینیم لە دەست دەچێ
راستییەكەو ڕابردووە
ئەوینی گەورە ئەوینی بێ تۆییە
بێ تۆییە منی
لەسەر ئەم زەوییەدا ڕاگرتووە

## نادیارترین دیار

دەنگێ لە غەیبەوە بانگم دەکا
دەزانم ئەوینی خۆمە دێتەوە ڕێم
زێمارێ لە غەیبەوە دێ
دەزانم گریانی خۆمە بەتاو بە سەرما دەبارێ
خودایە ئەوە چ ئەوینێکە
ڕۆحی وێرانم دەهاڕێ

## لە هەموو شوێنێکەوە بوون

هەر کتێبێ دەیکەمەوە
ئایەتی ئەوینی منی لێ نووسراوە
هەرشیعرێ دەیخوێنمەوە
باسی منێکی کوژراوە
ئەی میهرەبان چیت لێکردووم
ئابەم چەشنە لە بێخەوە هەڵتکەندووم

## گیای ئەوین

سەیری هەموو ئاوێنەکانم کردووە
تۆ لە ناو هەموو ئاوێنەکانی
بە هەموو زمانێ ئەوینی تۆم خوێندۆتەوە
تۆ زمانی هەموو کتێبەکانی
سەیری هەموو ئەتڵەسەکانم کردووە
تۆ لە ناو هەموو ڕەنگەکانی
هەمووجەنگەکانی ئەوینی تۆم کردووە
تۆ شمشێری پڕ بریسکەی
ناو هەموو جەنگەکانی

## ئاوی ناو تاشەبەرد

شوێن پێیەکانی تۆ بەسەر ئاوەکانیشەوە دیارن
بە شوێن پێیەکانی تۆوە گەیشتمە ئەو سەری دونیا
تۆ لە زەوی یا لە حەویقی ئاسمانی
تۆ یەقینی یا گومانی
ڕۆژێ دێ هەر شێتم بکەی
تۆ تەلارسازی ڕۆحمی
یا بۆ ئەو ڕۆحە ڕمانی؟

## تەڵەزم

چۆن لەشەڕاب جیات کەمەوە
کەمن لە مەداریا مەستم
چۆن لە زیندان جیات کەمەوە
کە من بە ئەوینی تۆ بەندم ؟

## بە چیا هەڵگەڕان

کە بانگت دەکەم هێند
دووری ئاوەکان وەڵامم دەدەنەوە
کە بانگت دەکەم هێند دووری
دارستانەکان وەڵامم دەدەنەوە
بۆیە سەرسامم نازانم
چۆن لە زەوی جیات کەمەوە؟

## سۆنگەی بوون

له ئەشکەوته دوورەکان، له دەریا قووڵەکان
لەناو هەڵەمووت و ڕەوەزه شاخەکان
لەنێو بەرزایی و نزمایی
لەباکوور، له باشور
له باران و له تەمتومان
لەزەوی له ئاسمان
تەنها ئاوازو چریکەی تۆیه
وجوود دەبەخشێ به ژیان

## سەدای با

ئۆف ئۆف چەند برینداری شەوقی تۆم
دەچمەوه بنارەکان تەنها تۆ دەبینم
دەچمەوه سەر ئاوەکان تەنها تۆ دەبینم
دەچمەوه دارستانەکان تەنها تۆ دەبینم
ئێسته دەزانم ئەوه تۆی
چەرخی گەردوون دەسووڕێنی و
مانگ و ئەستێران تاو دەدەی
چەقۆی ئەوینێکی دژوار
بۆ گەردنی من ساودەدەی

## گەڕانەوە بۆ کانگە

دەمەوێ بێمەوە لای تۆ
لای تۆ هەمووی سێبەرو تریفەو هێمنی و
ئاوو درەخت و باران و ساماڵ و تەمتومانە
لای تۆ هەمووی چریکەو تاڤگەو چڕینە
دەمەوێ بێمەوە لای تۆ
بەتەنها لای تۆ کانگەی ئەوینە

## ئێستەتیکای شکان

تۆ وەکو یاقووتی شکاو
لە هەزارلا دەبریسکێیتەوە
تۆ وەکو عەتری پڕژاو
لەهەزار لاوە بۆن و بەرامەت دێ
تۆ وەکو ئەوینی ڕژاو
لەهەزار لاوە دیلت کردووم

## داخستنەوەی کتێبەکان

کتێبی حیکمەتم کردەوە
پەندەکانی ئەوینت ڕۆحی هەڵتەکاندم
کتێبی شیعرم کردەوە
ڕستەکانی ئەوینت نکاڵی فیراقی
لە زەیندا چاندم
کتێبی سروشتم کردەوە
شەوقی ئەوینت تەمەنی فەوتاندم

## خاچی ئەبەدی

من جاویدانیم لە ئەوینت خواردۆتەوە
بۆیە تا ئەبەد خاچی ئازارم بە شانەوەیە
ژەهری شیرینی ئەوینی تۆ
وەها بەسەر مندا پژاوە
سەراپای زەمین
عەترو ئاقیقی پیادا ڕژاوە

## شەختەی هەناسە

پەراسووی ئومێدم لەمێژە شکاوە
ئەوینی تۆ نەبێ
ئەو دڵەم کەی خورپەی تیا ماوە
لەمێژە من کوختی ئەو ڕۆحەم ڕماوە
ئەوینی تۆ نەبێ
کەی کتێبی جەستەم
دڵۆپە خوێنێکی تیا ماوە؟

## خێرا خێرا بۆ دواوە

دەچمەوە بناران هێشتاکە وێنەی تۆی لێ ماوە
دەچمەوە ناو لوولەی شمشاڵان
هێشتاکە ئاوازێ بۆ ئەوینم ماوە
دەچمەوە ئەشکەوتان
کە هێشتا شوێن پێی تۆ
بەسەر کەڤرو تاوێر هەرماوە

## سفری دروستبوون

بەر لە تۆ من نەبووم
هەبوونم پووشێکی سەر ئاو بوو
بەر لە تۆ ڕەنگ نەبووم
تفرێکی کزیلەی خنکاو بووم
بەر لە تۆ دەنگ نەبووم
سەدایێ لە گۆزەی شکاو بووم

## شەرابی کۆنینە

پێویستیم بە شەرابێکی کۆنینەی توند هەیە
بە قەدەر ئەوینی کەونارت مەستم کا
پێویستیم بە شیعرێکی قووڵ و تەڕ هەیە
بە قەدەر قووڵایی تیشکی تۆ
هێورم کاتەوە
بەتەنها هەر شەڕاب و شیعرە
کە من لە تاوێر جیا بکاتەوە

## جەنگی سارد

کتێبێ لە حەسرەت ئەوینت

کەوتۆتە زەینی من

کتێبی ناو هەموو برینەکانی کەونە

شمشێرێ لە جەنگی ئەوینت

لە ڕۆحم چەقیوە

شمشێری ناو دەستی گەردوونە

## پاڕانەوە لە خوا

خودایە ئەبەدێکی کورتم لە ئەوین
هەناسەم درێژکە
خودایە ساتێکی ئەبەدیم لە ئەوین
مەوداکانم کورت کە
خودایە تەمەنێکی تاڵم لە ئەوین
مردنم شیرین کە

## ئاگری ئولیمپ

داستانی ئەوینم
دڵۆپێ ئاو نییە هەڵڕژێ
شووشەیێ لە عەتری گوڵ نییە
بە شاخی ئاسکان هەڵپژێ
داستانی ئەوینم ئاگری ئەبەدە
تا هەتا لە ڕۆحم بەر بووە
دەزانم ڕۆژێ دێ دەمکوژێ

## دەستەپاچە

قەڵەمێ لە خەیاڵ نەماوە
بە خەرجی نەدەم لە ئەوینت
وشەیێ نەماوە دایڕێژم لە وەسفی ئەوینت
شەڕابێ نەماوە مەستم کات
لە تەشقی ئەوینت

## گەڵایێ لە وەرین

چەند سەختە
وشێکم لە کتێبی تۆدا
هەمیشە خەتێکی ڕەشی پیا دەهێنی
دڵۆپە ئاوێکم
لە دەریای بەردەستت
دەتەوێ بۆ هەڵم و نەمانی بەیتەوە
ڕەنگێکم لە ئیشقت
ئەو کاتە گەش دەبێ
کە ڕەشم کەیتەوە

## شەفەقی نەهاتوو

شەوێکم لێ نەهات
سپێدەی ئەوینم سپی کات
بارانێ بە سەرما نەباری
گۆڵە گەنمی دڵم پڕ شیر کات
تیشکی خۆرەتاوێکت لێی نەدام
تاوەری وجودم گەرم کات

## پشت لە ئاسمان ڕوو لە زەوی

کەی لە ناو سەدیمی نادیاری دێیتەوە
کەی خۆت لە تەمتومان جیا دەکەیتەوە
کەی زەوی دەکەیتە ماڵی خۆت
وەك جاران بە ناو خاك و خۆڵا ڕێ دەکەی
دەزانم ئەوینم تەنها لە نەبوونت مەست بووە

## نەیژەن گوتی

دەچمەوە ناو نیشتیمانی قامیشەڵان
هەر ئەوێ کانیلەی پڕ نەوای ئەوینمە
هەر لەوێ لە ناخی لەتلەتی خۆم دەگەم
لەوێیە دەزانم فیراق چی لە دڵم کردووە
نەوای نەی بۆچ وا دەچریکێنی؟
لەوێیە کە فیراق
واز لە کونجی سینەی کون کونم دەهێنێ

## گێژەن

ئەوینم لە ڕیشەو ڕەگەزی گومانە
لە ناو بێشەی چڕی
هەزاران ڕستەی ناو زیندانی زمانە
ئەوینم لە ڕیشەو ڕەگەزی سپی تەمتومانە
لە نەوای هەزاران شمشاڵ و
هەزاران چڕین و بروسکەو تۆفانە

## گومان

هەموو ڕێگەو بانی زەوینم بڕیوە
بە دوای تۆ
لە ئاوە دوورەکانم داوە من بە دوای تۆ
دارستان نەماوە تەی نەکەم
بە دوای تۆ
بەڵام ئاخ
تۆ نە لە ئاسمان دیاری نە لە زەوی
تۆ نە لە ترۆپك و نە لە سای بنارانی
بۆییێکە دەزانم یەقین نیت گومانی

# شمشێرباز

که هاتییه بوونمەوه
من بوومه تەواوی ڕەنگەکان
که هاتیه بوونمەوه
من بوومه شمشێری جەنگەکان
ئێستاکه من شمشێرێکی سپی شەڕابیم
هەمیشه له ناو جەنگی مەستیم
وەشانم کتێبی وجودم دەدڕێنێ
کۆتایی به ئەفسانەی ئەوینم دەهێنێ

## مرواری هەزار ڕەنگ

لە خۆمم پرسیوە
لەبەرچی
هەمیشە دەچییەوە تەمتوومان
یا بۆچی هەمیشە بۆ دارستانەکان ڕادەکەی
یاوەکو موریدێکی شێتی زەردەشتی
بەسەر ئاوەکاندا
هەر سەیری خۆر دەکەی
بەڵام من وەڵامێکم نییەو نازانم
دارستان و ئاو و تەمتوومان
بەشێکن لە ئەوین
یا لەشکرێکن لە گومان؟

# هەڵکەندنی گۆڕ

زۆرم بیرکردۆتەوە
چ خوێنێ دادی تۆ دەدا
تا بۆ تۆی هەڵڕێژم
زۆرم بیرکردۆتەوە
چ گۆڕێ دەمشارێتەوە
تا لە پێناو ئەوینی تۆ
زەینی خۆمی تیا بنێژم
بەڵام ئاخ چ هەیە دادی تۆبدا
جگە لە کوژاندنەوەی پۆلووی ناخ ؟

## مانەوە لە گۆشەگیری

من ئێستاکە لقی دار هەنارێکی تەنیام
چاوەڕێتم ئارمووشی پەنجەکانی تۆ
لووڵم بدا و بمشکێنێ
من ئێستاکە تاقە درەختی ئاقیقی بنارانم
چاوەڕێتم هێزی هەزار ئەفسوونی تۆ
بۆنم بکا
بەو بۆنە من بۆلای
عەرشی خۆت بەیتەوە
من ئێستاکە کتێبێکم چاوەڕێتم
لەسەد ساڵان تاقە جارێ بمکەیتەوە

## هات و نەهات

گوێم لە دەنگێکە ناوێرم بۆلای بچم
دەزانم بەهەموو دارستانەکاندا
دەمگێڕێ و نایدۆزمەوە
گوێم لە زێمارێکە ناوێرم بۆلای بچم
دەزانم لە ڕەوەزو هەڵەموتان رامدەدێرێ
بۆیە لە کونجی سینەمدا
ئەو برینەم هەڵگرتووە
کە دەزانم ئەوە دەنگی
ئەفسانەی هات و نەهاتە
زۆرانی وەك من و تۆی پێ لە ناو چووە

## دیلبوون لە ئەوین

وەك دەریایێ ئەوینت
تووشی هەڵدانی کردووم
وەك دارستانێ ئەوینت
تووشی ڕەشەبای کردووم
وەك کانیێ ئەوینت
منی کردۆتە ڕووبار و چۆم
بزانە منت داوەتە دەست چ گێژەنێ
ئەی ئاوێنە و ڕابەری خۆم؟

## پارسەنگی ئاگر

دەمەوێ لە باوەشت بگرم
زۆر دەترسم
هەموو دونیا ئاگر بگرێ
دەمەوێ سەیرت بکەم
زۆر دەترسم
مینای چاوەکانم بڕژێ
دەمەوێ بەسەر کێوی ئەوینت کەوم
زۆر دەترسم
بەفر دابکاو مەرگ
هەموو ڕێگاکان بگرێ

## تەنهاترین کتێب

هەندێجار وەك پیرێکی نوورانی
لە پڕێ وەژوور دەکەوی
هەندێ جاریش وەك منالێ
ڕکە دەگری و جێم دەهێڵی
لە یەکەم هەر وەکو سکڵ گەش دەبمەوە
لە دووەم هەر وەك کتێبێ
کە دەستێ نەیکردبێتەوە ڕەش دەبمەوە

## شەڕ لەگەڵ دەریا

تۆ لە بەرچاوم چەند گەورەی
دەڵێی پانتایی ئاسمانی
تۆ لە بەرچاوم چەند دووری
دەڵێی گەنجینەی تابانی
ئاخ تۆ ئەی شەرابی هەزار ساڵە
لەبەرچاوی من چەند گەشی
دەڵێی سەدەفێکی سپی ناو دڵی
نەهەنگێکی دەریای ڕەشی

## تاجی زەوی

هەر قومە ئاوێ دەخۆمەوە ئەوە تۆی
لە هەر پەنجەرەیێ شنەیێ دێتە ژوورەوە
ئەوە تۆی
ڕووبەڕووی هەر لەشکرێ دەبمەوە
ئەوە تۆی
ڕۆحم پڕ شمشێری فیراق دەکەی
لە هەر بەزینێ خۆم دەبینم
ئەوە تۆی
تاجی سەرکەوتن و شکۆ لەسەر دەکەی

## سوڵتانی ئەوین

ئەوەتا تۆ لەو سەری زەوییەوە دیاری
وەکو زیو دەبریقێیتەوە
لە ناو هەموو ئاوەکانی
لەناو بەفرو با و بۆرانی
ئەوە هێزی ئەوینمە
تۆی پەرش و بڵاوی هەموو دونیا کردۆتەوە
وادەکا تۆ لە هەموو شوێنێکا سپی بچیتەوە

## پووشی بەر با

بێ تۆ من هەبوونم نییە
بێ تۆ من چیم
تۆ هەمیشە لە تەکمەوەی
لەناو لەپی دەستەکانمی
لە ناو گلێنەو خوێنمی
لەناو کتێب و قەڵەم و پەڕە کاغەزەکانمی
لەناو سێبەرو سایەمی
بۆیە هەرگیز من تەنها نیم

## له كه‌وتنی ساماناكدا

كه‌ی وه‌ك ئاسكێ ڕێیه‌كانی ون كردبێ
ماڵی پووشم پڕ له‌ گڕی چاوت ده‌كه‌ی
كه‌ی دێیته‌وه‌ وه‌ك حه‌كیمێ
برینه‌كانم سارێژ بكه‌ی
له‌م كه‌وتنه‌ ئه‌به‌دییه‌ ده‌ستم بگری و
ڕزگارم كه‌ی؟

## ده‌نگی ورد و خاشبوون

دڵی من ئه‌وه‌نده‌ شكاوه‌
بۆ هه‌ر شوێنێ بچم
پارچه‌ی دڵم ده‌دۆزمه‌وه‌
وه‌ك نوورێ له‌و شوێنه‌ ده‌دره‌وشێته‌وه‌
دڵی من ئه‌وه‌نده‌ شكاوه‌
بچمه‌ هه‌ر كه‌نارێ گوڵی سوور ده‌بینم
هێنده‌ خوێنی دڵمی به‌سه‌ردا ڕژاوه‌

## مەیلێکی کوشندە

دەزانم تۆ تەمی سەرچیاو زەنوێری بنارانی
دەزانم تۆ سەرابی ڕێگە دوورەکانی
دەزانم هەنگوینی نێو قەدی
ڕەوەزە شاخێکی دژواری
دەزانم تەمەنیش دەڕوات
هەر دەستم ناتگاتێ
مەیلێکەو تێکەڵی خوێن بووە

## مرواری ژێر دەریا

نە چاو ماوە تۆ ببینم
نە هێز ماوە بۆت بگەڕێم
ئێستاکە تۆ مروارییێکی پڕ بەهای کەوناری
لە قووڵایی دەریای دڵی بچووکمدا

## بەردەکان گۆرانی ناڵێن

لە شەپۆڵەکانم پرسیوە
بۆ ڕەنگی تۆ لە ئاو دەچێ
لە گەڵاکانم پرسیوە
بۆ دەنگی تۆ لە با دەچێ
لە کڵپەکانم پرسیوە
بۆ ئەوینی تۆ لە گڕ دەچێ
لە گوڵەگەنمم پرسیوە
بۆ بۆنت لە بۆنی خاك دەچێ
ئاو و با، گڕ و خاك، گوڵەگەنم و کڵپە
ئاوەها سەرسامی لولیدان
زمانیان لە گۆچوو ڕازێکیان نەدرکاند

## یاری

لەگەڵ بایەکاندا هەڵدەکەی
لەگەڵ بارانەکاندا دەباری
لەگەڵ مەلەکان هەڵدەفڕی
لەگەڵ شووشەکاندا دەشکێی
لەگەڵ عەتردا دەپڕژێی
لەگەڵ گەڵاکان سیس دەبی
لەگەڵ گیاکان شین دەبیەوە
دەبینی چ لە دڵی من دەکەی ؟

## ڕەنگی دیماهی

دڵی من وەك گۆزەی شەڕابێ
هەرجارەی بە جۆرە ئەوینێ
سەری من مەست دەکا
دڵی من وەك کوانووی ئاگرێ
هەرجارەی بە جۆرە پەنگرێ
دەروونم گەش دەکا
دەزانم ئەو گۆزە لە گەڕان بە دوای
تۆ هەر دەشکێ

## زیندانی بن دەریا

من ئێستاکە مینا گەوهەری بن دەریا
هێزی ئەوین
وەك قەدی کۆتەرەدارێ دەمهەژێنێ
چاوەڕوانی دەستی ئاوینی تۆ دەکات
لە قووڵایی قوڕی بن دەریام دەرهێنێ

## کەشتییەك تۆی

دڵی من دڵ نییە ئاوێنەی ئەوینتە
ڕێی دوورو دژواری پێ دەبێنم
خوێنی من خوێن نییە جوانیتە
بەناو گەرداوی لەشما دەسووڕێ
هزری من گومانە
داڕشتەی زمانم دەگۆڕێ

## ماڵێك لە ناو خوێن

کە چیاو تاوێران دەشکێنم
وێنەی تۆ لە قووڵایی دایە
بنار هەڵدەکۆڵم سیمات
لە ناو خاك و خۆڵدایە
کە ئاوێنەکان دەشکێنم
وێنەی تۆ لە جیوەکانایە
ئەو کاتەیش کە کاسەی دڵی خۆم دەشکێنم
سەراپای وجودت لەماڵی خوێندایە

## گەڕانەوە لە دیلی

دەرگاو پەنجەران دادەخەم
کتێبی ئەوینت لەسینەم دەردێنم
دیواری ژوورەکان
بە قورقوشم سواخ دەدەم
بەڵام ئاخ دەنگت لە گوێم نابڕێتەوە
سیمای تۆ لەبەر چاو ون نابێ
تۆ چوویتە ناو ڕۆحی شکستەم
وێنەی تۆ چۆن لە ئاوێنەی شکاو دەکرێتەوە؟

## شانامە

کتێبی ئەوینت ئەوەندە گەورەیە
سەدان ساڵە دەیخوێنمەوە تەواو نابێ
ڕووباری ئەوینت ئەوەندە تیژپەڕە
سەدان ساڵە هەر ڕادەکەم و نایگەمێ
ڕستەی ئەوینت ئەوەندە درێژە
سەدان ساڵە دەینووسمەوەو تەواو نابێ

## ئاشکرابوون

من هێندە فرمێسکم ڕشتووە و گریاوم
بۆیە من لە سایەی ئەوینت
هەست دەکەم
لە قوڕ نیم لە ئاوم

## فەنەری منالّی

تۆ لە بەر چاوما هێند بەرز بوویتەوە
ئەندێشەی بینینم هەتەری تۆ ناکات
تۆ لە سینەم هێند نزیك بوویتەوە
هەوای هەر هەموو ئاسمانەکان
بەشی هەناسەی مانەوەم ناکات
تۆ مەعشوقی منی یا جەللاد؟

## وەهمی خود

ڕۆژەکانیش بەسەر دەچن
تۆ زیاتر دەچیتە قووڵایی دڵمەوە
مانگەکانیش بەسەر دەچن
تۆ زیاتر دەچیتە قووڵایی خوێنمەوە
ساڵەکانیش بەسەر دەچن
تۆ زیاتر دەچیتە قووڵایی خەیاڵم
لە کۆتاییدا دەزانم شتێك نیم جگە لە تۆ

## نزیکتر لە دەماری ملم

دەزانم تۆ لە تەکمەوەی بۆنت دەکەم
بۆنی تۆ وەك بۆنی کراسی یوسفە
بیابانی ڕۆحمی شەڵاڵی ونبوونت کردووە
بۆنی تۆ بینایی دەبەخشێ بە چاوم
دەزانم تۆ لە تەکمەوەی
بۆیە من تا ئێستاش هەر ماوم

## درەوشانەوەی سەرەتا

دەچمەوە ئەو قانە زەویانەی پیایا تێپەڕیوم
کەچی تۆ لەوێدا هەرماوی
دەچمەوە ناو ئاوە دوورەکان
کەچی تۆ هێشتاکە هەر ماوی
دەچمەوە ناو دڵی ئەشکەوتە تاریك و تاریکەکان
کەچی تۆ لەوێدا هەرماوی
بۆ هەرشوێنێ بچم تۆ لەوێی
تۆ دەورەی ئاسمان و زەمین و هەموو کەونت داوە
هەربۆیە دەزانم کە ئابلۆقە دراوم
لە هەزاران لاوە

## ڕووچوون لە بۆشاییدا

بە بام گوت
هەڵمگرە ببەوە شوێنە دوورەکان
بەڵکو شوێن پێی تۆ لەوێدا بدۆزمەوە
بە ئاوم گوت هەڵمگرە بە ناو دونیادا بمگێڕە
با سەدایێ لە ئەوینی خۆم ببیستمەوە
بەڵام نە با تۆزێ وەستاو
نە ئاو هەڵوەستەیەکی کرد
بۆیە زمانم سیس هەڵگەڕا

## لە چاوەڕوانی ئاگردا

بڕیار دەدەم بۆ یەکجاری لەبیرت کەم
بەڵام دەزانم
هیچ بڕیارێکم لە دەست نەماوە
ئێستاکە من پووشی بەربای ئەوینی تۆم
دەبێ هەمیشە لە چاوەڕوانی داگیرساندا بم

## گەمە لەگەڵ مەحاڵ

کە دڵم دەکرێتەوە ئەو ساتانەیە

کە پڕی عیتری ئەوینت بووە

کە دڵم توند دەبێ ئەو ساتانەیە

کە تژی ژەهری دوورینت بووە

کە دڵم ئیدی هیچی نەماوە ئەو ساتانەیە

کاتێ دەزانم هێند دوورکەوتیەوە

هەست دەکەم کەوا لە ئاسمانانی

هەرگیز ناتگەمێ

## لە دوور دوورەوە

تاقە گۆرانییەکم هەیە

هەمیشە بۆ خۆم دەیچڕم

بەڵام نازانم لەبەرچی

ڕۆحم وا هەڵدەتەکێنێ

لە ناو سینەمدا

تاقە ئەسپێکی سوورخنم هەیە

بەڵام نازانم بۆ دەنرکێنێ

ئەوەی دەیزانم ئەوینێك هەیە

بوون و نەبوونی من دەگرییێنێ

# ناوەندی کەوتن

سپێدەی من
پڕیەتی لە چاوەڕوانی
پڕیەتی لە ڕمان
سپێدەی من
پڕیەتی لە یەقین
پڕیەتی لە گومان
سپێدەی من
پڕیەتی لە سووتانی ڕۆح و دڵشکان

## یەکەم ماڵ

خاك و هەڵۆم نووسی
ڕەونەقی شیعرەکان تۆ بووی
تەمەسپییەکانم نووسی
شەبەقی سووتانم تۆ بووی
کە وردە گەڵاشم نووسی
سەوزایی درەختم تۆ بووی
پیانۆی ڕۆژهەڵاتم نووسی
سەمای نۆتەکان هەر تۆ بووی
درەختی حیکمەتم نووسی
فەلسەفەی ئەوینم تۆ بووی
دۆستێ کە هەمیشە چاوەڕوانیم ئەکا هەر تۆ بووی
سکڵی ناو خۆڵەمێش بووم
تۆ ڕەشت کردمەوە
ئەوێستاش وامزانی چکم کردووە
بەڵام ها دووبارە
بە بای تەڵێ لە وەنەوشەی پرسینێکت
وەك پشکۆ گەشت کردمەوە

## تروسکێ لە بریفکانەوە

نووریێ هەڵئەچێ
بۆنی بارانی ناوەختی لێدێ
تەمی بنار و لوتکەی گرتووە
ڕەنگە بۆ ئەبەد نەڕەوێتەوە
ئەو تەمتوومانە
ئەشقی کەوناری دێرین دۆستێکە
هەر وەکو ئاقیق ئەدرەوشێتەوە

## کتێبی قەدەر

بە دەنگی نەی ڕستەی جوانیت ئەخوێنمەوە
بە ڕەنگی بەی ڕستەی جوانیت ئەنووسمەوە
بەڵام تا دێ ئەم ڕستەیە هەروا
درێژ
ئە
بێ
تە
و
ە

## سیمای تاقانە

تۆ لە ڕەگەزی بارانی
بۆیە هەر لە باران ئەچیت
تۆ لە ڕەگەزی مەلانی
بۆیە بۆ ئاسمان هەڵئەچیت

## جوانی لە هەموو شوێنێکا

لە دوایین ترۆپکی بەرزیدا
غەریبی نزماییم کردووە
لە قووڵایی کپی دەریادا
بانگی نەوڕەسی تەنکاییم کردووە
گەلێ جار لە ناو هەستی سپی نامووسی شیعردا
قسەم لە ڕەشباوی چارەنووس کردووە
لەو پەڕی هێز و گوڕ
حەسوودیم بە ئێستەتیکای بێهێزی بردووە

## ئەندێشە

هەندێ جار هەست ئەکەم ئەوە تۆی
وەکو با داگیرت کردووم
کە ئاو ئەخۆمەوە ئەوە تۆی
تینوێتیم ئەشکێنی
کە ئەگریم ئەوە
تۆی فرمێسکم ئەڕژێنی
پێئەکەنم ئەوە تۆی
مەملەکەتم بە عەترت ئەڕشێنی
کە ڕائەکەم ئەوە تۆی بەرە و فەنا ئەمڕفێنی

## فاوست

له پەیمانەی سەدان بادەی ئەویندا
مەینەت و تاڵیشکم چەشتووە
شەهدی ناو هەنگوینی فیراقم ڕشتووە
له پەیمانەی سەدان ڕەنگی ئەویندا
هەندێ جار ڕۆحی خۆم
داوەتە دەست شەیتان
هەندێ جار فریشتە

## ئەسپی دەریا

من کتێبێکی شینم پیتی بەرگم فیراقە
ناوەرۆکم کەوتن و شەبەیخون
ژمارەی لاپەڕە و کۆتاییم
دوو دڵۆپ فرمێسك و
سەدان جار سووتان و غەرق بوون

## پەلکە سیحر

بە دوای ئاوی جاویدانی تۆ ئەگەڕێم
بەڵام هەرگیز نایدۆزمەوە
پەلکە سیحری ئەوینم  ون بووە
سەر زەمینم تەی کردووە و ناگەمە جێ
کەون پڕ لە سەدات بووە
بەڵام نازانم سەدای تۆ لە کوێوە دێ ؟

## ئەماتۆر

نەئەبوو لەو بەری تەیمانی جودایی
سەیری تراژیکی ئاوابوونت بکەم
نەئەبوو لەو سەری ڕێگەی دوور
ماڵاوایی سیمای ناو تەمی تۆ بکەم
ئەبوایە لە پشتی تەیمان و ڕێگەی دوور
بووبامە شەوق و نوور

## تاتۆ

به شیری ڕژاوی ناو مەمکی تەوتەمێ
به جەوهەری سپی شەوبۆی دوور
به با، به ئاوی گیا نووسیبوم
من هێڵی ناو لەپی دەستی تۆم
قەدەر و بەختی تۆم
بۆیەکە تا ئەبەد دیلی تۆم

## زیوی فڕیو

نەرم بووم
بێدادی ئەوین و فیراقت
کردمییە تاوێری دژوار و سەختەنداز
بەرز بووم
غرورم هەڵیدامە نێو زەنەك
دەریا بووم
هەڵچوونم کوشتمی
نەوی بووم
شاباڵی ئەوینت ڕایدامە لانەی باز

## وێنەکانی تۆ

ئەچمەوە ئەشکەوتان تۆ لە وێی
سەیری چاوی ماری ڕەش ئەکەم  تۆ لە وێی
نوقمی زوقم و شەختەی چیا ئەبم تۆ لە وێی
دواجار پەی ئەبەم کە تۆ لەم وجوودە
هەم هۆیت و هەم بەرهۆی

## تا دوا سنوور

تۆ ئەزەلی منی
خێراتر لە با
مەندتر لە ئاو
ڕوونتر لە گیا
کەونارتر لە کۆنترین دەسنووس
تۆ ئاگاهی منی مەزنتر لە هەبوون
ڕەشتر لە بەفر و سپیتر لە ئەبەنووس

## چەتری بەر با

لە سای تۆ کەوتنم ڕووەو ئاسمانە
مانەوەم ئەو پەڕی نەمانە
سپیم ڕەشە و ڕەشم سپییە
بێدەنگیم ئاوازێکی ئەبەدییە
هاوارم تا دوا سنووری کپییە

## قووڕی خەیاڵ

لە ناوەوەڕا ئەتبینم
تۆ لە دەرەوەی زەمانی
لەدەرەوەڕا ئەتبیستم
تۆ لە ناوەوەی زمانی
لە ناو زەماندا ئەتبینم
تۆ لە دەرەوەی ژیانی
لە دەرەوەی زمان ئەتبیسم
تۆ لە ناوەوەی گیانی
لە بەرزاییدا ئەتبینم
تۆ لە باوەشی نەوییەکانی
لە نەوییەکانیشا هاودەمی تەوقی ئاسمانی
لە باوەشی شەیتانەکان ئەتخوێنمەوە
کەچی کتێبی هەرە پیرۆزی فریشتانی

## سپیڕەش

که لە وەرزشی بەیانیاندا تۆم بینی
جووتێ ڕانی ئەبەنووسی
دەریای ڕەشم بیرکەوتەوە
که لە وەرزشی ئێوارانددا تۆم بینی
جووتێ ڕانی کافووری
دەریای سپیم بیرکەوتەوە
که بەیەکەوە نووساین
دەریای سپی و ڕەش تێکەڵ بوون

## قاوەی سووتاو

بە ناو دەمارەکانما چەشنی خوێن دێیت و ئەچی
بە ناو جوانییەکانتا چەشنی ئاو دێم و ئەچم
چەشنی خوێن بە ناو دەمارەکانتا دێم و ئەچم
چەشنی ئاو بە ناو شیوەرەکانما دێیت و ئەچی
من شەرابی سەما لە جوانییەکانتا دائەگیرسێنم
تۆ جوانی و فیراق لە ناو دڵی ماندووم

## کەمین

پەنجەکانت
کۆمەڵە هەورێکی سپین نەرم ونیان
کە لە دوورەوە سەیریان ئەکەم
هەست ئەکەم لەشکرێ لە بەرابەرما وەستاوە
چاوەڕێیە من بگەم شەبەیخون دەست پێبکات
بەڵام من هەر زوو
لە مەیدانی ئەو شەڕە ڕائەکەم
ئاڵای سپیت بۆ هەڵئەکەم

## گومەز

له ناو سینەت دوو ڕێگر هەن
زەوییان له من تەنگ کردووە
دوو مەیفرۆشی سەلار هەن
شەراب له من ئەشارنەوە
دوو شمشێر هەن
هەمیشە هەر بە دوامەوەن
دوو جەنگاوەری نەرمین هەن
له ناو لەپی من شەهید بوون
له ناو سینەت دوو شیعر هەن
ئەوەندەم خوێندوونەتەوە
خەریکە له شەقەی باڵبدەن

## تەنك تەنك

تۆ
لە شووشە و لە دڵۆپەی ئاوی ڕوونی
کە پێکە وێسکیەکەت هەڵدا
گەردنت سوور سوور ئەچۆوە

## بەرز بەرز تا قووڵایی

لە جۆگەلەم پرسی بۆ بە پەلەی؟
ووتی ڕووبارەکان بانگم ئەکەن
لە ڕووبارم پرسی بۆ بە پەلەی؟
ووتی دەریاکان بانگم ئەکەن
لە دەریام پرسی بۆ بە پەلەی؟
وتی زەریاکان بانگم ئەکەن
هەموو شتێ لەم کەونەدا
بۆ سەرچاوەی خۆی ڕائەکاو دائەکەوێ
تەنها من و تۆ نەبێ
کە قەدەرمان بۆ تاهەتا
بەرەو فیراق ڕێئەکەوێ

## سەدا

دەنگ لە ڕەنگی ئاوی پرسی بۆ بێدەنگی
ڕەنگ لە دەنگی ئاوی پرسی بۆ بێڕەنگی
ڕەنگ دەنگی خۆی لە ناو زەماندا شاردەوە
دونیا پڕ بوو لە بێدەنگی
دەنگ ڕەنگی خۆی لە ناو زماندا شاردەوە
دونیا خاڵی بوو لە جوانی

## پشوو

جەنگ تەواو بوو
مامۆستاکان چوونەوە پۆل
وەستاکان چوونەوە سەر تەلار و دیوارەکان
کچەکان چوونەوە بەر بێری
شوان بۆ ڕان
قەشەکان چوونەوە دێرێ
عەتارەکان دەستیان بە عەترسازی کردەوە
تەنها شەهیدەکان نەگەڕانەوە

## مەحاڵ

ئەزانم تۆ چەندە بەرز ببیتەوە
ئەوەندە من بەرەو قوڵایی ئەبمەوە
کە تۆ نوقمی ئاوان ئەبی
من وشکایی قووتم ئەدا
کە لە تۆ نزیك ئەبمەوە
تۆ دوور و دوورتر ئەبیتەوە

## یەکەم ئەوین

کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان دوورتر
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان نزیکتر
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان گەورەتر
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان بچووکتر
کۆڵانێ گەورەتر لە ئاسمان و زەمین
ئا لەم کۆڵانە دا بوو
دڵم پڕ بوو لە لیرەی ئەوین

## کلیل

ئەبینی دەرگا چەند دۆستی کلیلە
دڵی خۆی بۆ ئەکاتەوە
ئەبینی کلیل چەند دوژمنی دەرگایە
دونیای لەسەر دائەخات؟

## دادی زەمەن

خۆی پەشیمان ئەبێتەوە
با لە جوانی خۆی ڕامێنێ
با هەر قاسەی پڕ گەوهەری کلیل بدا
رۆژێ دادێ گەوهەرەکەی
هیچ بەهایەکی نامێنێ

## هاوزا

ئاسمان کووپەی پڕ شەرابی فریشتانە
مانگ مەلەوانگەی ئەستێران
خۆر ئاگردانی خوداوەندە
زەویش زیندانی ئەبەدیی مرۆڤ

## گلان

مرواری چاوی تۆ لە ناو دڵی ماسیدایە
ماسیش لە ناو دەریا دایە
دەریاش لە هەناوی زەریا دایە
کلیلی زەریاش لە ناو دەستی قەدەر دایە
سەیرکە من سیزیفێکی چەند گوناهم
چارەنووسم
لە هاوکێشەیەکی ئاوەها مەحاڵدایە

## ئەبەدێکی ون

لە باکورەوە بۆ لات دێم

تۆ هەر ونی

لە باشوورەوە بۆ لات دێم

تۆ هەر ونی

لە ڕۆژهەڵات، لەڕۆژئاوا، لە قوتبەکان

بەڵام تۆ هەر ونی

**نەگونجان**

هەست ئەکەم من

تیشك بەشی چاوم ناکا

نە هەوا بەشی هەناسە و نە قەڵەم بەشی ڕووناکی

باران بەشی درەختی تەنهاییم ناکا

هەست ئەکەم من

هەرگیز ناگەم بە ئاسمان و

لە زەویش جێم نابێتەوە

## قەقنەس

ئەبێ بە هەموو کەوندا بسوڕێمەوە
تا بگەم بە تۆ
کە دڵنیام لەو سەرەوەش
بە کۆشێ زوخاڵی جەستە دێمەوە
دەرکەوتنی تۆ سەرەتای ئاوابوونی منە
ئاوابوونی تۆش کۆتایی دەرکەوتنی منە

## شاپرس

من لە ناو قایغێکی شکاوم
تا دێ دەریا گەورە ئەبێ
تۆش هەتا چاو هەتەر ئەکا
لە من بە دوور ئەکەویەوە
لە ناو ئاوازێکی مەستم
دەستم پەیمانە ناگرێ
من بایەکان لە کوێ بێنم
تۆ بۆ لای من بهێننەوە؟

## ڕەنگی ڕەنگەکان

دەستم پڕە لە کاغەز و دڵم پڕە لە ئاوێنە
تۆش لە ڕەگەزی تیشك و ئاوی
بە کام حیکمەت بتنووسمەوە
لە چ نوورێکا داتڕێژم
کە تۆ هەموو نوورەکانی
چ کتێبێ سۆراغ بکەم
کە ڕەونەقی هەموو پیت و وشەکانی؟

## قسه بکه

که ئەدوێی وشەکانت ئەبن بە قەند
لە دەمی چیا ئەتوێنەوە
جۆگەلەکان پڕ لە شەهدی هەنگوین ئەبن
پیتەکان ئەبن بە مرواری
لەناو دڵی تاریکی شەو ئەشنێنەوە
که جوانیت تاوێر هەڵوەرێنێ
دەبێ حاڵی دڵم چی بێ
تۆ هەمیشە بدوێ

## گەوهەری یەکدانە

تیشکی سپێدەیەکی تۆم هەڵپاچی
ئاسمانی پڕ کردم لە نوور
بزەی ئێوارەیەکی تۆم دەرهێنا
من لە ناویا بووم بە بخوور
ڕۆحی خۆم بەرهەلا کرد
تۆ لە ناویا بووی بە تەم

## دوورترین تیشك

تۆ چەند دووری ئەڵێی وای لەو سەری دونیا
تۆ چەند نزیکی ئەڵێی لە دەماری ملمای
دووریت مردنم خۆش ئەکات
نزیکیت بریقەی شمشێری سەر ڕۆحم
خامۆش ئەکات

## ئاسك

منت له ناو هەزاران توله ڕێی خۆر شاردۆتەوە
سپێدان پەنجەران ئەکەمەوە تیشکی خۆری
ئێواران ئەچمەوە سەر گردەکان پڕوشەی بارانی
که به دواتا ئەگەڕێم تۆ وەك ئاسك له دوورەوە
تێکەڵ بەگیا ئەبیتەوە
ناتوانم بتناسمەوە

## گەڕانەوەی ئەبەدی

هاوارەکانم یەك یەکە
ئەگەڕێنەوە ناو سینە
فرمێسکەکانم دەنك دەنك
ئەگەڕێنەوە ناو چاوم
بەڵام تۆ ئاخ تۆ هەرگیز ناگەڕێیتەوە

## مێزێك لە هەموو مێزەكان

ڕوناهی خلود ئەپڕژێتە سەر شوشە بەتاڵكراوەكان
دوكەڵێكی تەنك لە جگەرەوە هەڵئەسێ
نە كەسێ لەو دەوروبەرەدا ماوە
جگە لە قوڵپە قوڵپی قەتارەی شەرابی بافاری
نە زرینگەیێ، نە دەنگێ
تەنهاو تەنها خۆی و ساقییە جوانەكەی قەفقاسی
ئەو قوم قوم لە ساقی ئەخواتەوە
بەرەو عەدەم هەڵئەكشێ
ساقی نیگا نیگا لەو ئەڕوانێ
هێزی مانی پێ ئەبەخشێ

## تارژەن

هەموو ئەوانەی نووسیومن
تروسکەیەکن لە درەوشانەوەی تۆ
پڕوشکێکن لە ئاگردانی سەد ڕەنگی تابانی تۆ
شەونمێکن لە سپێدانی پڕ سەفای ڕامانی تۆ
بروسکەیەکن لە شمشێری هەزار تیغی فیراقی تۆ

## تا سنووری شەفەق

هەموو شتێ لە تۆوە دەست پێئەکا
شیعر لە دڵەوە تا سنووری شەوق و دیوان
تەنهایی لە دڵەوە تا مەرزی شێت بوون
وەستان لە دڵەوە تا دوا ترۆپکی کەوتن
منیش لە ناو لەپتەوە تا دوا نەشئەی سەما

## گۆزەی تیشك

کە تۆ تەنها فریادرەسی مەحاڵم بی
ئەبێ تا هەم
قەفتەی سپی ئەو شمشێرەم
هەر لە دەست بێت
کە شەرابت بخۆمەوە
ئەبێ زۆر بچووك ببمەوە
تا جێم لە ناو گۆزەی تیشکی تۆ بێتەوە

## تارومار

تەنها جارێ تۆم بینی
بۆ ئەبەد خۆمم نەبینییەوە
تەنها جارێ ڕێم کەوتە ناو باوەشی تۆ
بۆ ئەبەد بووی بە نیشتیمان
ئێستا هیچ ڕێگایەك نەماوە تەی نەکەم
بەڵام هەموویان ئەمبەنەوە نێو ئەو نیشتیمانە

## تروسکەیەکی دوور

من و کۆمەڵێ ئەستێرە و چەند بوتڵێ شەراب
چوینەوە بناری سارای وجوود
هەموو شتێ لە جووڵە کەوت
با، باران، سەرخۆشی، ئاو، ڕووبار..
بەڵام دڵی خۆم بینی لە ترۆپکی سەمادایە
تۆش لە ناویا وەك فەنەر ئەبریقایتەوە

## هەڵگرتنەوەی ڕووناهی

کە لە بەرابەر درەوشانەوەی تۆدا ئەوەستم
هەموو نهێنییەکانی کەون ئەبینم
کە دەست لە ناو دەستم ئەنێیت
دەزانم تازە نایەمەوە دۆخی خۆم
کە تێکەڵی تۆ ئەبم
ئەزانم تازە نەماوم بۆ ئەبەد تواومەتەوە

## کوشتنی مەحاڵ

ئەکرێ بە ناو شووشەی شکاودا بڕۆم
بیر لە نووسینی شیعر بکەمەوە
ئەکرێ لە ئاوا بخنکێم بیر لە ژیان بکەمەوە
ئەکرێ لە ناو ئاگردا ئەوینیی لەگەڵ ئاو بکەم
لە شەوەزەنگا بیر لە مانگ بکەمەوە
هەموو شتێ ئەکرێ هەتا سەماش لە ناو بادا
ئەوەی کە ناکرێ ئەوەیە فیراقی تۆ بەرم نادا

## سەمای جەمسەرەکان

پیشەی من گەڕانە بەدوای مەجازی تۆ
پیشەی تۆ نادیاری
من و تۆ دوو ئاراستەی ئاگر و ئاوین
وردو خاشبوونی گۆزەی دڵ
هەڵڕژانی ئاوی چاوین
بە یەك بگەین دوکەڵی فیراق زەوی دائەپۆشێ

## سیفری بوونەوە

هەنێجار ئەڵێم تۆ کاژی
لە ناو هەموو چیاکاندا هەی
هەنێجار ئەڵێم تۆ بازی
لە سەر هەموو لوتکەکاندا هەی
هەنێجار ئەڵێم تۆ ماسی
لە ناو هەموو دەریاکاندا هەی
هەندێجاریش ئەڵێم نا تۆ گیای
لە ڕەگەزی هەزار ئەفسوونی گومانی
بەڵام نا تۆ قوفڵی سەر دەرگای زمانی

## داگیرساز

تۆ چەند خێرای هەر ئەڵێی بای
ئەی مەملەکەتی ئەبەدی
تۆ چەند تەنهای هەر ئەڵێی خوای
ئەی بوونەوەری سەرمەدی
تەواوی عەرشت لێ گرتووم
تۆ چەند سپیت هەر ئەڵێی کاغەزی
نیشتیمانی شیعرت لێ داگیر کردووم

# گیا

بەدواتەوە بووم
کە تۆ وەك ئاسکێکی سەوز
بە ناو پاوانەکانی ڕۆحمدا ڕاتئەکرد
بەڵام ئاخ
لە گەڵ گیا تێکەڵ بوویت و ناتناسمەوە
بۆیە ناچارم پەلك پەلك
هەرچی گیایە هەڵدەمەوە
بەڵکو تۆ بدۆزمەوە

## ترمیسکی ون

دەستێکم لە ڕۆژهەڵاتە و بە دوای تۆدا ئەگەڕێ
دەستێکیشم لە ڕۆژاوایە و بە دوای تۆدا ئەگەڕێ
چاوێکم لە باکوور، چاوێکم لە باشوور
تەواوی زەوی گەڕاوم تۆ لە کوێی ؟

## تاج

گەڵاکان ئەڕژێنە ناو ئاو ون ئەبن
وێنەکان ئەڕژێنە ناو ئاو ون ئەبن
دەنگەکان ئەڕژێنە ناو ئاو ون ئەبن
تەنها تیشکی هەزار ڕەنگی تۆ نەبێ
کە ئەڕژێتە دڵی ئاوەکان
شەڵاڵی جاویدانی ئەبێ

## مەجازی هەمتا

من لە فیزیای نیگەرانی تۆدا
لە پەلوپۆ کەوتووم
لە ئەتمۆسفیری هەزار ڕەنگی تۆدا
سەرسامیی دڵم ئەشواتەوە
گومان لە گیانم بەرئەدا
تۆ میتافۆرێکی سەیری
فەخفوری دڵم خاش ئەکەی
هەموو وردە خەیاڵ و ئاقیقی زەینم
لە ئاش ئەکەی

## بتی سپی

تۆ لە کیمیای نێو قوتووی عەتارەکانی
بۆنی هەموو دەرمانێکت هەڵگرتووە
تۆ مۆروی گەردەنی قەرەجە کەونارەکانی
بۆنی جوگرافیای هەموو نیشتیمانێکت گرتووە
تۆ ئاوی خلودی
هەوڵی هەموو گلگامێشەکانی زەوی
لەناو لەپی سیحراوی تۆدا مردووە

## ستوونی بوون

چرایێ دائەگیرسێنم
جوانی تۆم بۆ ئەگێڕێتەوە
هەناسەیێ ئەدەمەوە سووتانم ئەگێڕێتەوە
قەڵەم بە کاغەز دادێنم وێنەکانت هەڵئەڕژێن
کە ئەمەوێ وێنەکانت کۆکەمەوە
فیراقت وەك چەپکێ بخوور
عەترەو بە دڵما ئەپژێ
جەدوا ئەبەخشێ بە هەبوون

## مێتافۆر

دانی پیاه ئەنێم تۆ وەك با

چەرخی دڵم ئەسوورێنی

تەواوی زمانم ئەوە تۆی

بە ناو ئەلفابای کەوندا ئەپژێنی

تەواوی بیستنم ئەوە تۆی

سەدای لێ هەڵئەڕژێنی

تەواوی هزری من ئەوە تۆی

مناڵیمی پێ ئەجمێنی

تەواوی جەستەی من ئەوە تۆی

کە خوێنی لێ ئەدەڵێنی

وەك بی ناو ئاو ئەملەرزێنی

## ڕەزی پۆڕنۆ

چاوێکت قاپی شەرابە
مەیخانەی ئۆروکم دێنێتەوە یاد
چاوێکیشت قاپی ترێ
ڕەزەکانی فیردەوسم دێنێتەوە یاد
چاوی تۆ کانگەی ئەبەدیی مەستیی منە
هەرگیز تەواو نابێ

## ئەفسوون

دەستێکت پڕە لە بۆن
بەوە دونیا سەرخۆش ئەکەی
دەستێکیشت پڕە لە جوانی
بەوە دونیا داگیر ئەکەی

## کوانوی خۆر

ئەی زێڕێژی گەروی ئەوین
ئەی دەنگی شکاوی شوشە
ئەی پروشەی ڕژانی ئاو
تۆ چەند دووری و منیش چەند بە پەلەم
ماڵەکەی تۆ لە ناو تیشکی خۆرەتاوە
گەر بمەوێ سەردانت کەم
ئەبێ لەو سەرەوە بە خۆڵەمێشی بێمەوە
بەڵام هەر دێم

## تا دوا ترۆپك

دڵت بۆتە ڕەوەزێکی سەخت
کەسێکی لێ دەرباز نابێ
زۆر هەوڵم دا
شوێنێ لەو دڵە داگیر کەم نەمتوانی
بەر لە مردنم هەوڵێکی تریشم دا
دوا جار کوژرام و هەر نەمتوانی

## هاوکێشەی بوون

تۆ لە مەحاڵدا مەیسەر بوون دروست ئەکەی
لە نەبووندا جەزبەی هەبوون دروست ئەکەی
بێ شەراب سەرخۆشم ئەکەی
بە گیای خلود شەونمی سپێدە و سافم بۆ ئەنێری
بۆوەی کەوتن نەمکوژێ
نامەی عەترم پێ ئەسپێری

## قووڕی یەکەم

ڕەنگی تۆ لە دەرەوەی ڕەنگەکانی ئەم بوونەیە
دەنگی تۆ لە دەرەوەی دەنگەکانی ئەم بوونەیە
هەبوونت لە دەرەوەی نەبوونە
نەبوونت لە ناو شەبەنگی هەبوونە
تۆ کائینێکی خورافی
تۆ لە قوڕێکی بێ پەنجەرە و بێ شکافی

## گەورەترین گۆڕستان

دەرەنجام مۆبایلەکەمە
ئەبێتە گەورەترین گۆڕستان
چونکە هەموو ئەوانەی خۆشمئەوێن
ناویان هەیە و هەمووی لە وێن

## بەرزەخ

جگەرەکەت بۆ دائەگیرسێنم
تۆش دڵم دائەگیرسێنی
دەبینی لە میانی دوو داگیرسانا
فریزی هەستی من ژیلەمۆی سووتانە؟

## ئەوپەڕی تا

بۆ لات دێم بزانم تا ئەبەد لە ڕێدام
من بەو قەدەرەوە بەندم
چونکە نێم مردن بانگم ئەکات
لەو ڕێیە هەمیشە لە دایك ئەبمەوە

## مانەوە لە خنکان

سەری بوتڵێ شەرابی فینیسیم شکاند
هاتنەوەی تۆم بیرکەوتەوە
سەراوسەر خۆم هاوێشتە ناو ئاوی فیغان
فیراقی تۆم بیرکەوتەوە
چەند جارێ لەسەر یەك خنکام

## گەڕانەوە بۆ کانی یەکەم

کە دەمم نایە ناو دەمت
تامی وجوودم بیرکەوتەوە
تامی یەکەم قومە شیری خاوم بیرکەوتەوە
کەدەمم نایە ناو دەمت

## زیندان

که هاتی ئەمنووسی
هەموو گیانم لای تۆ بوو
کە ڕۆیشتی یەکجاری کەوتیە دڵمەوە
بۆیە خەمبارم بۆ ئەبەد
لە دڵما بەند بووی

## ئەندێشە

لە هەزار و نۆسەد و پەنجاو پێنجەوە
من بۆ تۆ هاتوومەتە بوون
نازانم لە هەزار و چەند بۆ تۆ
ئەکەومە تۆڕی لە ناو چوون ؟

## بەردی نەرم

سەختە بەوە مەحکوم بم
تۆ هەمیشە تەوقی ئەزەلی سەرم بیت
چی ئەبێ تۆ تاقە  بەردێکی گەرم ونەرم بیت؟

**مرۆی ئەشكێن**

دەمار دەماری خوێنمت

پڕ لە عەتری فیراق  كردووە

من ئێستاكە خوێنم نییە

ئەوەی بە لەشما ئەسووڕێ

ئەشكی فیراقە

## له شوێنی خۆی

من کێشەیەکی ئاڵۆزم
لافاوێکی تووش
حیکمەتێکی سەخت
تادێ کێشەکانم ئاڵۆزتر ئەکەی
لافاوی من تووشتر ئەکەی
حیکمەتی بوونم قووڵتر ئەکەی

## ئاوین

سپی ئەوینت
منی بردەوە بەفری کۆساران
کاتێ بووی بە با
قامیش بەرەو ئاوازی بردم
بەڵام کە ئاو بوویت سیمای ئاوینت
شارەزای هەموو ئاوانی کردم

## بەلەمی شکاوی زمان

که بیر له تۆ ئەکەمەوە
با دێ سڵاوم لێئەکات
ڕووبار بە لام ڕائەبووری
شەونم بەیانی باشێك وچەپکێ ئاوم بۆ ئەنێری
باران له سامال ئەباری
زێ پڕ ئەبێ و کانییەکانیش ئەتەقنەوە
کە ئەمەوێ قەڵەم بگرمە دەستم و بتنوسمەوە
زمانم ئەشکێ و زەینی غەریبم لاڵ ئەبێ
قەڵەمم تارومار ئەبێ

## شکانی دەنگ

من شمشاڵێکی داخراوم
دەنگم لە ناخم گیر بووە
هەزار چەشنە نەوام هەبوو
هەزاران ئاواز و بەستەی خودام هەبوو
فیراقی تۆ هەمووی لەمن ڕەشکردەوە
من شمشاڵێکی بێ سەدام
ڕۆژێ هەردێ لە تاو فیراقی ئەبەدیت
دڵی کونکونم لە نەوای خۆی بکەوێ

## گیای سەر تاشە

کێ هەیە وەك من
لە ماناى سپى ئەوینت بگات
با سەیری ئاردی ئێقسانم بکات
کێ هەیە وەك من بۆ بای  نووسیوە
با سەیری گەڵای
زەرد هەڵگەڕاوی پەنجەکانم کات
کێ هەیە وەك من
بۆ بە ئاوبوونت تەمی چڕی بێ
با سەیری پشکۆی زمانم بکات

## یەکەم ڕاچڵەکین

بۆ تاوێ لە ناو تەمی چیاکان
ئاوی تەنهایی بوونم خواردەوە
بەڵام بۆ ئەبەد
گیرۆدەی خەونی لەگەڵ تۆیی بووم
بۆ تاوێ لە ناو کێڵگەی دەشتەکان
هات و هاواری دەوروبەری خۆم
لە دڵ شاردەوە
کەچی بۆ ئەبەد
گیرۆدەی دەستی بە بێ تۆیی بووم

## له هه‌موو لایه‌كه‌وه

تۆ وه‌ك ئاو له كه‌ڤرێ هه‌ڵئه‌قوڵێی
وه‌كو با له كێوێ هه‌ڵئه‌كه‌ی
وه‌ك باران له هه‌ورێ ئه‌باری
وه‌ك گیا له تاشه شین ئه‌بی
وه‌ك مه‌ستی
سه‌رم پڕ خه‌یاڵی ئاڵ ئه‌كه‌ی
وه‌ك مه‌لی ناو قه‌فه‌ز
فڕینم پڕ په‌ڕوباڵ ئه‌كه‌ی

## هەڵوەشانەوە

سەرەتا حەرفێکم ئەزانی
ئەوینت لێی کردم بە ڕستە
ڕستەشی لێ کردم بە دێڕ و
دێڕیشی لێ کردم بە لاپەڕ
لاپەڕەی لێکردم بە کتێب
فیراقت کتێبی لێکردم بە پەڕ و
پەڕیشی لێکردم بە دێڕ و
دێڕیشی لێکردم بە ڕستە
ڕستەشی لێکردم بە حەرف
ئەبینی وەك بەرداش
چۆن دروستم ئەکەی
پاشانیش ورد وخاش؟

## خۆ نەبوون

تەماشا چەند سەیرە
من بە دوای ئەوینت وەکو پووشی بەربا
پەرش و بڵاوی هەموو سەر زەوی کراوم
وەکو ئاو ڕژاومە ناو هەموو بناریێ
من تازە بزانم هی خۆم نیم
من موڵکی ئاگر و باو ئاوم

## بێهوده

تۆ هەر وەك شەراب وای
چەند هەڵترژێنمە ناو زەینم
ئەوەندە ئەندێشەم ڕەگاژۆی تۆ ئەبێ
تا خەیاڵ بڕ ئەکا خۆڵەمێشی گەرمی سووتانم
بە دونیای پوچیدا وەرئەبێ

## بانگی بێ زمان

هەمیشە کەروێشکەی پەڵە گیاییێکی دوور
بە گەروی شنەیێ
بانگی ڕۆحی مات و شکاوی من ئەکا
کە بۆنی شەرابی جودایی تۆی لێدێ
هەمیشە بناری چیایەك بە زمانی سێبەر
هاواری ناو خوێنی من ئەکا
کە وێنەی مەجاز و حەقیقی تۆی لێبێ
هەمیشە جۆبارێ بە هێزی خوڕەیێ
دەمباتە ناو دەمی حەزیایێ
کە نەوای شمشاڵی فیراقی تۆی لێدێ

## بەرزکردنەوەی پەیمانە

من وادەم بە ئاگری تۆ داوە
بچم لە ناویا سەما کەم
قسەشم لە گەڵ بای فیراقت کردوە
من وادەم بە ڕۆشنایی تۆ داوە
تاریکی بێ تۆیی تەی بکەم
ئێستێ چۆن ئەتوانم چرا داگیرسێنم
کە بێ تۆیی بۆتە
بەشێکی خودایی لە خوێنم

## کۆکردنەوەی خەیاڵ

خەیاڵی خۆم کۆکردەوە
تۆزێکیم لێ کرد بە شەراب
شار ئەو شەرابەی خواردەوە
تۆزێکیم لێکرد بە بخور
ئیرۆك مەیخانەکانی خۆی پێ شاردەوە
تۆزیکیم لێکرد بە حەشیش
شاعیرەکان نامەی خۆیان
بۆ خوای شیعر پێ ناردەوە
خەیاڵی خۆم کۆکردەوە
شەقامەکان پڕ بوون لە سەمای قەفقاسی
مەیخانەکان پڕ بوونەوە
مەودا نەما بۆ چوونەوە
ئەو شەوە بوو بە درێژترین شەوی دونیا

## هەرای ئیستەتیك

زرینگە زرینگی مەیگێڕەکان
ئاهەنگ سە رێکی لێرە بوو
سەرێکی تری لە شەهوەت
هیچ شتێ لە مەداری ئاگاهیدا نەما بوو
هەمووی لە نێو نائاگاهی ڕەهادا بوو

## شەرابی نێرڤانا

کەی ئەگەڕێیتەوە ناو خوێنم
ئەی ئاسکی تەریوی ڕۆحم؟
من لە باکوور و لە باشوور
لە خۆراوا و خۆرەڵات
هەمیشە بۆ تۆ وەستاوم

## ڕۆیشتنی سەر شووشە

کە چوومەوە لای کەناران
با پێی گوتم تازە لێرەوە ڕەت بووە
کە چوومەوە لای بناران
باران گوتی تازە سڵاوی لە ئاو کرد
کە چوومەوە لای ئاوەکان
شەپۆل گوتی تازە بێرەوە تێپەڕی

## خێراتر لە با

تۆ ئاگرێکی چەند تووشی
خوڕەیەکی چەند بەسامی
بایەکی چەندە بە گەفی
بارانێکی چەند بە تینی
تۆ هاوینێکی چەند ساردی
زستانێکی چەند گەرمی
پاییزێکی چەند سەوزی
بەهارێکی چەند ژاکاوی

## سەرپشك

وەرە بمكوژە ئەزانم بە كوشتنم
ئەگەمە باخی ڕووناكی
وەرە بمكوژە ئەزانم بە كوشتنم
ئەكەومە ناو مەینەتییەكانی جوانی
كە پڕە لە گوڵی مەریەم و
دۆزەخییەكانی تەنایی

## سەمای شین

ئەمەوێ ببمەوە خۆڵەمێش
تا دووبارە تێکەڵ بەم خاکە ببمەوە
یا مشتێ گەڵای وەریو بم
تا بچمەوە سەر تەڕایی ڕەگ و ڕیشە
بەڵام کە تۆ خاك و گوڵەگەنم بیت
لە سینەما شین ئەبیەوە

## ڕەهابوون

سەرتاسەری ئەم سەر زەوییە گەڕاوم
ئاسمانانم تەی کردووە
نە لە زەوی و نە لە ناو تەشقی ئاسمانی
بۆیە دڵنیام کەوا تۆ
لە ناو ڕەهادا پەنهانی

## قەدەری من

دێمەوە لای تۆ، تۆ جەوهەری بوونی
دێمەوەە لای تۆ
تو کتێبی
دێمەوە لای تۆ
تۆ بروسکە و شەبەیخوونی
دێمەوە لای تۆ
تۆ سرەوتن و وچانی

## پاكبوونەوە

هەست ئەكەم تۆ
هاودەمی گشت بایەكانی
بۆیە لەگەڵ هەموو بایێ
من مەست ئەبم
هەست ئەكەم تۆ
لەگەڵ هەموو ئاوەكانی
بۆیە لەگەڵ هەموو ئاوێ
غەرقی شەرابی خەست ئەبم
هەست ئەكەم تۆ
لە ناو هەموو درەختانی
بۆیە لەگەڵ هەر گەڵایێ
تووشی نێرڤاناى هەست ئەبم

## ترازان

که تۆم ناسی
قومێ ئاو بووم منت کرد بە کانیلەیێ
کانیلەت کردم بە ڕووبا
ڕووبارت کردم بە دەریا
دەریات لێ کردم بە زەریا
ئەوین وەها داگیری کردووم
قەت وەك خۆم لێنایەتەوە

## شامی نالی لە شاما

کێیە ئەوە بانگم ئەکاو نازانم
بانگ و هاواری لە کوێیە
کێیە ئەوە هەموو شەوێ
دێتە خەونم و ناییناسم
کێیە ئەوە خڕ سپێدان
دەستی لە ناو دەستم ئەنێ
وەکو پووشێ، وەك گەڵایێ
بەرە و ئاوەکانم ئەبات
کێیە ئەوە وەها بە کوڵ
وەها بە ڕۆحی پڕ گریان بانگم ئەکات ؟

## تەوقی ئەبەدی

لەو خۆراوایە خەمگینە
کەی ئەمبەخشی
بە درەختێکی تەنها و ئاوا ئەبی
کەی لە شەوبۆ دامئەڕێژی
تا لە ئێوارانی ساردا
بۆنی خوێنم دوور دوور بڕوات
کەی دێیتەوە
وەکو جاران دەستم بگری و
بچینەوە بۆ خەمگینی، بۆ ڕۆژهەڵات

**زیوی زێ**

کەمێ لە وەرینی گەڵا

گەڵایێ هەڵاتوو لە پاییز

کەمێ لە ڕەشێتی بەختم

بەختێ ماندووتر لە مامز

کەمێ لە خەمی فیراق

فیراقێ سەختتر لە مردن

کەمێ لە بەردێتی دڵت

دڵێ ئاخ دڵێ

دۆزەخی دروست کردووە

## جیابەندی

من لە ناو ڕەشاییدا
لە باوەشێ گیای سپی ئەتشارمەوە
تۆش بە شەونمی سپی پەنجەت
زوو زوو ڕەشم ئەکەیتەوە

## هانا

ئەبینی چ ئاڵۆزییەك
لە دەریادا باڵی گرتووم
بانگم بکە و بەرەو کەنارم بەرەوە
تەمی مانگ
دەریای وەك  فەریك زەرد کردووە
خێراکە گەمیەکەت بهێنە
ماسی شیعر لە سەر زمانم مردووە

## دوا هاوڕێ

ڕێگەیەکی دوورمان بڕی
بەفرێکی زۆرمان لێ باری
تەنها من و کتێبفرۆشێ ماینەوە
هەموو کتێبەکانیشمان سووتان
بەڵام گەرم نەبووینەوە

## مانگی سپی

که تەوقەمان کرد
دەستی لە ناو دەستم توایەوە
ئاخ ئەو دەستە چەند نەرم بوو
کە باوەشمان بە یەکا کرد
هەستم کرد کەوا ئەسووتێم
خودایە ئەو جەستەیە چەند گەرم بوو

## شام

شەوێك  هەتا درەنگ
درەنگ درەنگ
سەرم لە ناو دەسنووسێکی نالی نابوو
تەم دایگرتم
خەونم بە هیجرەتی یەکجاری ئەو بینی

## مەینەتی

کەی ئەگەڕێیتەوە ناو خوێنم
ئاسکی تەریوی ڕۆحم
من لە باکوور و لە باشوور،
لە خۆراوا و لە خۆرەڵات
هەمیشە بۆ تۆ وەستاوم

## ماڵەکەی تۆ چەند دوورە

لە دەریای یا لە بیابانی
لە ناو لەپی میهر و تەمی
یا لەناو دڵی شەیتانی
تۆ لە زەوی
یا لە مەلەکوتی ئاسمانی؟

## مۆرد

باران نامەی بۆ هێناوم
ئەزانم تۆ لە ئاسمان نیت
گوڵە مۆرد هەواڵی داومەتی
ئەزانم تۆ لە زەوی نیت
شەپۆل بانگی منی کردووە
ئەزانم تۆ لە دەریا نیت
بۆیە دڵم پڕ ئاگری گومان بووە
تۆ لە ڕەگەزی خواوەندانی
لە ئینسان نیت

## ناو

دونیات لە ناو نهێنیدا شاردۆتەوە
ئاشکراییت ڕامکردووە
من ناوی تۆم بە گیا نووسیوە
پەیکەرێ لە نهێنی تۆ دروست ئەکەم
خۆر لە ئاستیا دابمرکێ و
منارە بچەمێتەوە

## وەسوەسە

هەندێ جار لە نێو خەوندا
خەون ئەبینم
لە نێو شووشەی ئاودا
بیابان ئەبینم
بۆ لوتکە ئەچم ئەگەم بە بنار
لە نێو دەریادا تەرمە شەپۆل و نەوڕەسی کەنار
لە نێو تابلۆدا مەرگی ڕەنگەکان

## تەنها

هەموو شتێ لە مەداری خۆی ترازاوە
تەنها تو نەبیت وەك شەوقی ئەزەل
وێنەکانت بە جامی ڕۆحم چەسپاوە

## تاسووق

1

من مارکوپۆلۆم خەون بە فینیسەوە ئەبینم

بە تاق و قەڵاکانی

بە رەوەزە شاخی تەڕ و پڕ لە بارانی

بە باڵای بەرزی کچەکانی

بە مێژوی پڕ لە فیشەك و

جوگرافیای ساردی لوتکەکانی

ئەزانم بشگەڕێمەوە

دەرگای ماڵەوەم لە فینیس نادۆزمەوەو

خزمەکانم نامناسنەوە

دەرگای شارم بە ڕوودا ناکەنەوە

2

من مارکۆم هەمیشە خەون بە فینیس ئەبینم

باخەڵم پڕیەتی لە لیرەی زێڕو شیعری نایاب

پڕیەتی لە حیکمەتی سەفەر و پەینی ئەزموون

دڵم کوانوی ئایندەیە

فینیسی دایك نامناسێتەوە

## شا وشه

نووری تۆ تاکە
ڕستەی ناو کتێبی مەستیە
لەوە زیاتر ئەو کتێبە
هیچ حەرفێکی تێدا نییە
کە تۆ تەنها باقە نوور بیت
لە ناو کتێبی مەستیما
دەبێ تا هەم لەو شەرابە بخۆمەوە

## ڕاوی سەخت

ئەزانم ونبوونی تۆ
چ دەرکەوتنێکی کورتی بە دواوە دێ
ئەزانم دەرکەوتنی تۆ
چ ونبوونێکی ئەبەدیی بە دواوە دێ
ونبوونت شەوێکی درێژە و
دەرکەوتنیشت خۆرەتاو
دەرکەوتنت ڕۆژێکی کورتە و ونبوونیشت
شەوێکی نووتەك و ئەنگوستە چاو

## شەبەنگ

هەندێجار وامدێتە خەیاڵ
کە تۆ خۆری
چونکە هەموو سپێدان
پەنجەرەم پڕ ئەبێ لە تۆ
هەندێجاریش وا هەست ئەکەم
تۆ بارانی
چونکە هەمیشە بۆنی تۆ
وەك تەم
وەك بخوور
لەم خاك وخۆڵە هەڵئەسێ

## گۆران

که ئەگەمە نزیك ماڵەکەی تۆ
دونیا سپی سپی ئەبێ
هەموو ڕێیەکان ون ئەکەم
دەرگای ماڵەکەت لە ئاوە
لەگیا و لە ئەشك و هەتاوە

## هەزار مانگ

وەك هەزاران هەزاران مانگ ئەدرەوشێتەوە
چۆنت بناسمەوە
کە تۆ لە ناو هەموو مانگەکانی؟
کە دەست بۆ هەر مانگێ ئەبەم
ئاوا ئەبێ و ئەتوێیتەوە
چۆنت بناسمەوە
کە لە هەموو تیشکەکانی
کەونت تژی خۆت کردووە
جێی من لە کوێ ببێتەوە؟

## کتێبی ڕژاوی تیشك

تۆ گۆزەی شەرابێکی سوور و کەوناری
تۆ پەلکە سیحری ناو دەفتەری شیعری
هەزار ساڵە بە شەرابی ڕژاوی تۆ
لە ناو کتێبی مەستی ئەژیم
هەزا ساڵە بە سیحری تۆ
دەستم داوەتە شمشێر و
لەناو داوی مەحاڵ ئەژیم

## شەونمی ڕژاو

کێ ئەو گەڵا حاجیلانەم بۆ ئەهێنێ
کە لە بن بەردان شین ئەبوون
کێ هەیە ئەو هەموو بۆن و بەرامە
ئەو هەموو جوانییەم بۆ بێنێ
کە لە دوای بارانی ناوەخت
لە خاکی کتێب هەڵئەسا
مینا سواری جوانیی
بەناو برینم ڕەت ئەبوون
کێ ئەو دەنکە گەنمانەم بۆ کۆئەکاتەوە
کە لە برسیەتی لێم پژان
کێ ئەوهەموو قومە ئاوانەم ئەداتێ
کە لە تینوێتی لێم ڕژان؟

## دیزاینی دڵ

دەمەوێ لە تەمی وەهم و قووڕی خەیاڵ
دڵێ بۆ خۆم  دروست بکەم
تڕی گریانی ئەوین بێ
شوورەکەی لە دەنگی با بێ
خوێنەکەشی لە تەمتوومان
ئاوی لە بنی دەریا بێ
خورپەی لە تریفە و تابان
تۆ لە ناویا کتێبی مەستی و خلوود بی
ئەبەدییەت لە زناری کەمەرتا بدرەوشێتەوە
نەمری ببەخشێ بە بوونم
دواجار تاجێ بێ لە شەونم

## قایغ

من ئەمەوێ بە نهێنی باست بکەم
تۆش هەمیشە
خۆت لە ناو زمانم شاردۆتەوە
بیرچوونەوەکانی من سەختترن
لە هەموو بیرهاتنەوەکانی تۆ
بۆیە زمانم دەیبەستێ و نایەتە گۆ
بوونی تۆ لە فیزیای سەرم ئەپەڕێ
بەڵام وەك قایغێ شەپۆل ڕاوی بنێ
دێ و لە ناو خوێنما ئەگەڕێ

## مایەی بوون

وەها تێکەڵی هەستم بووی
بوونت بوونم داگیر ئەکا
پایەی من لەسەر زەویدا
بۆ تا هەتا ڕاگیر دەکا

## ساماني خەياڵ

تۆ ئاگرو ئاوی منی
ئەی تەونی هەزاران رەنگی من
کە ئاگریت ئەوە ئەوینی تۆیە
ڕێ ڕێ ئەمسووتێنێ
کە ئاویت ئەوە زێی تۆیە
دەمار دەمار ئەمخنکێنێ
تۆ جوانترین مەلەکوتی
تۆ کەون و کائیناتی منی
تۆ ئاخ تۆ
چەند لە سەرووی وجوودی منی

## شكۆ

تۆ چیت ؟
لە نووری یا لە تەمتومان
لە گیای
لە بای
یا لە قوڕی باخی جینان
لە بەفری یا لە بارانی
تۆ تەوتەمی
یا لە تۆوی پڕ لە بریقەی ئینسانی

## کەوانەی شکاو

بە کام ڕەنگی ئەبەدي تۆ
لە ڕۆحما بنەخشێنم
ئەو حیکمەتە لە کوێ بێنم
نووری تۆ بنووسێتەوە
جاویدانی بە دەست بێنم
کە دەرگای هیچ کتێبێکم
بە کلیلی ئەزەلی تۆ نابێتەوە
هەر دێڕێ من لە ئاقیقدا دائەڕێژم
لە دوای تۆ ڕەش ئەبێتەوە

## بوون بە کتێب

لە کتێبخانەکەما
کتێبی بۆنی تۆم هێنایە دەر
ژوورەکەم پڕ بوو لە عەتر
کە کتێبی بارانی تۆم هێنایە دەر
ژوورەکەم پڕ بوو لە چەتر
کە کتێبی ڕوخساری تۆم هێنایە دەر
ژوورەکەم پڕ بوو لە شەکر
کە کتێبی فیراقی تۆم هێنایە دەر
ژوورەکەم پڕ بوو لە بەفر

# هەڵم

من هەمیشە لە سرووتێکی هەڵماوی
بەرەو هەورەکان ئەبمەوە
لەو سەرەوە لە وێنەی باران دێمەوە
کە دووبارە
لە ناو گڕی تەنهاییدا ڵاڵم ئەکەی
من بەرەو ئاسمان ئەبمەوە
سەیر سەیر ئەی دڵی خۆم
لەمیانی هەڵم و هەوردا
چۆن من بووکەڵەی دەستی تۆم

## سەما

کەهاتی
من خەریکی نووسینی سیحری تۆ بووم
کە گەیشتی
سیحری نووسینم بەتاڵ بوو
کە ڕۆیشتی
من تووشی داوی مەحاڵ بووم

## هەرگیز ئاوڕ مەدەرەوە

بۆ بەرزایی پێویستیمان
بە بازدان و تێکشکانە
پێویستیمان بە کەوتن و هەڵکرووزانی ئێسقانە
ئەبێ بە تەن شووشەی شەراب بەتاڵ بکەین
تا جیلوەیەکمان دەسکەوێ
هەزاران تەن قووڕي خەیاڵ
بۆ بان سەرمان بگرینەوە
تا یەك دێر شیعریی تەڕمان بەرکەوێ
چاومان لە بینینی تازە ڕابهێنین
بەردی سیزیف بخەینە شان
لە پەنجەرەی ماڵی نیتشە ئاگر بخۆین
تا بچینە جەستەی سوپەرمان
یا ئەوەتا واز لە باڵی فڕین بێنین
پێمان لە زەوی ڕابێنین
بەرزاییەکان شانی ئەوێت بیخەیتە بەر
بۆوەی تاجی جاویدانی بکەینە سەر

## دۆڵی قووڵ قووڵ

من هەستێ دامئەگرێ
ئاو ئاسا خنکانم لە لافاو بۆ دێنێ
ئەوە تۆی ئاوی من
من هەستێ دامئەگرێ وەك ئاگر
سووتانم بەسەر باڵی پشکۆ بۆ دێنێ
ئەوە تۆی گڕی من
من هەستێ دامئەگرێ با ئاسا
ونبوونم بە سەر پشتی زریان بۆ دێنێ
ئەوە تۆی ئەی بای من
تۆ ئاو بیت یا ئاگر یاخود با
ئەوینەو من بەرەو عەدەمی تاڵ ئەبات

## مانەوە لە سێوێك

من و تۆ پێکەوە
تیشکی مانگی دوورمان لە شەودا چنیوە
هەزاران سەبەتەی شەفەقمان
لە باخی سپێدە ڕنیوە
بەفرمان لە بانانماڵیوە
هەنگوینمان لە شانەی شاخاندا دزیوە
سەدان جار پێکەوە
عەترمان لە گیای کوێستانان هاڕیوە
قاوغمان لە گوڵی مەریەمە چنیوە
من و تۆ پێکەوە

## کانگەی کەونار

هەموو ئاوەکان ئەگەڕێنەوە لای تۆ

تۆ سەرچاوەی ئاوەکانی

هەموو بایەکان دێنەوە لای تۆ

تۆسەرچاوەی بایەکانی

هەموو ئاگرەکان بۆ لای تۆ دائەگیرسێن

تۆ سەرچاوەی هەموو ئاگرەکانی

## کانگەی کەونار

هەموو ئاوەکان ئەگەڕێنەوە لای تۆ
تۆ سەرچاوەی ئاوەکانی
هەموو بایەکان دێنەوە لای تۆ
تۆ سەرچاوەی هەموو بایەکانی
هەموو ئاگرەکان بۆلای تۆ دائەگیرسێن
تۆ سەرچاوەی هەموو ئاگرەکانی

## کتێبی توانەوە

کە تۆ با بیت
ئایینی من تەنها لە بەر با وەستانە
کە تۆ هەمیشە بەفر بیت
ئەبێ بۆ ئەبەد کتێبی توانەوە بنووسمەوە

## کاڵبوونەوە

جاران پرچم وەکو دەریای ڕەش ئاوابوو
ئێستا بۆتە دەریای سپی
خورپەی دڵم وەکو زەنگی کەلێسا بوو
ئێستا وەکو چکانی ئاو
چاوم خۆر بوو ئێستا بۆتە چراویلکە
هاوارم بروسکەو با بوو
ئێستا وەکو دەنگی بنگۆم
روخسارم پەلکە زێڕینەی پڕ سەما بوو
ئێستا وەکو پووشی دەم با
هەتا دێت کاڵ ئەبێتەوە
ئاوێنەکانم یەك یەکە جیوەیان خاو ئەبێتەوە

## ئەتوانین هەمیشە خەون ببینین

ئەمەوێ شمشێر لە پێ کەم
دوکەڵ لە سەر
تەم بخۆم و شیری ماین بخۆمەوە
ویسکی ئاگر هەڵقوڕێنم
هەر یەکەو خاچی خۆی بە شانەوەیە
هەریەکەو تراژیکی خۆی لە دڵیا ئەنێ
هیچ شتێ بۆ تا هەتا وەك خۆی نامینێتەوە
بۆ ئەوەی باڵانسمان هەبێ
ئەبێ بیر لە خۆشەویستی بکەینەوە

## تەنها تەنها

ئەزانی چەند تەنهام
تەنهاتر لە دەشتایی خوای پەنهان
تەنهاتر لە شیعری پڕ برین
تەنهاتر لەتەونی بێ نەخشان
لە شیعری بێ ئامان
لە گریان
لە گیان
لە گیا

## دواجار

ئەوەندە سەیری قووڵایی دەریام کردووە

بەدوای تۆ

پشتم کووڕ بۆتەوە کووڕ

تەمەشا تەمەشا شمشێری فیراقت

چۆن بە ناو خوێندا شۆڕ بۆتەوە

## تارمایی

تۆ چیت ؟
نە کتێبی هەموو ڕۆژێ
بچمەوە ناو ڕەوەزی وشەکانت
نە ڕووباری
خۆم لە ئاوی پیرۆزت بشۆمەوە
نەچیمەنی
دەست لە ملی لکە گیاکانت بکەم
نە خەونی
سپێدانی سەرم خامۆش کەی
نە پەنجەرەی بە سەر دونیاما بڕوانی؟

##ماڵی شیعر

چوومە ماڵی سپێدە
رۆحم پڕ بوو لە شنەبا
چوومە ماڵی نیوەڕۆ
دڵم پڕ بوو لە هەتاو
چوومە ماڵی ئێوارە
جەستەم پڕ بوو لە غەریبی
چوومە ماڵی شەو
سەرم پڕ بوو لە ئەستێرە
چوومە ماڵی گیا
لەپم پڕ بوو لە خوناو
کە چوومە ماڵی شیعرێکم
هەردوو چاوم پڕ بوو لە فرمێسک

## ژیان

هەر جارێ  تەوقەی لەگەڵ ئەکەم
نیوەی خوێنم هەڵئەمژێ
هەر جارێ  سەیری ئەکەم
نیوەی بیناییم ئەکوژێ
هەر جارێ  ماچی ئەکەم
تەواوی جەستەم ئەتوێتەوە
کە تێکەڵ بە یەکیش ئەبین
هیچ شتێ لە ئارا نامینێ
هەموو شتێ وەك خۆی لێ دێتەوە

## سەختەنداز

وامزانی تۆ پشکۆی
دەستم هێنا کوژایەتەوە
وامزانی تۆ شەوقی
هاتم و توایەتەوە
وامزانی بای
خۆم دایە بەر گڤە و گەفت
ڕۆیشتیت و نەمایەتەوە
وامزانی بارانی
هاتمە بەر لێزمە و ڕێژنەکانت
بۆ ناو هەور گەڕایەتەوە
زانیم ڕەگەزی تۆ لە مژادی وونبوونە
قەدەری منیش بۆ ئەبەد هاتووچوونە

## تەونی خەیاڵ

تەنهاماینەوە
من و باقەیێ خەیاڵ
کە بەشی پێکێکی قەیتانی نەئەکرد
من بەو خەیاڵە
سەراپای تراژیکی ژیانم نووسییەوە

## ئاوونگ

لە ناو هەموو قۆزاخەیێ
کرمێ هەیە ئەیناسم
باسی جوانی ئاوریشم ئەکا
لە ناو هەموو دڵۆپە شەونمێ
شەوقێ هەیە ئەیبینم
باسی  تەمی سپێدە ئەکا
لە ناو هەموو هەموو مەیخانەیێ
ساقیێ هەیە ئەیناسم
بە ڕەگەز ئەچێتەوە سەر گەڵامێو
باسی سەمای مەستی ئەکا
لە ناو هەموو شەوێکی درێژ
تروسکێ هەیە ئەیهێنم
باسی ڕووناهی زیو ئەکا
لە ناو هەموو شەپۆلێ ئوفیلیایێ هەیە
باسی هاملێتی خۆی ئەکا
لە خوێنی منیش هەمیشە زەنگێ هەیە
تا هەتا بۆ تۆ لێئەدا
باسی فیراق و نەی ئەکا

## مردن لە ڤینیس

لە ناو ڕەفەی کتێبخانەیەکی کەونارا
کە لە ناو کەشییەکەدا
کتێبەکانی پەڕ پەڕ بوو بوون
لاپەڕەیەکی زەردی ڕۆمانی
مردن لە فینیس ی توماس مانم دۆزییەوە
هاواری ئەکرد
مردن لە ناو جوانییەکاندا
هاوتای خنکانە لە دەریا

## زەوینی داخراو

ڕێگاکان ئەو سەریان نەبوو، شارەکان خاپور
تەنها من و ئەو، لە قاتی سەدەمی خەیاڵ
چاوەڕوانی هەڵاتنی زیومان ئەکرد
تا دووبارە بەو ڕێگایانەدا بەڕێکەوینەوە
دڵنیاش بووین ناگەین بە هیچ

## ئازادبوون

له پێکی یەکەم پەنجەرەیێ
له زیندانی سەری مندا کرایەوە
له هی دووەم دەرگا کڵۆم دراوەکان
له هی سێیەم بەربەست و هەم دێراوەکان
له هی چوارەم ئازادیم بە دەست گرت
هاوارم کرد پێکێکی تر
نهێنی کەونم داگیر کرد

## چەقین لە با

لە ناو کەشتییەکەدا مامەوە
سەد ساڵ بەر لە ئێستا بوو
ئێستاش هەروام لە ناو کەشتییەکەدا
دونیاییکی چۆڵ، دەریاییکی قووڵ
هەروا چاوەڕوانم
چوزانم
سەد ساڵ بەر لە ئێستا بوو

## ئەسپی سپی

ئەسپە سپییەکان
لە سپیاتی تەمتومانا سپی ئەچنەوە
سپی ئەچنەوە ئەسپەکان لە سپیاتی تەمتومانا
تەمتومانە سپییەکان
لە ئەسپەکان سپی ئەچنەوە
سپییەکانی تەمتومان لە ئەسپان سپی ئەچنەوە
ئەسپەکان لە باخی سێودا دەحیلێنن
زۆر ئەترسم
بۆنی سێو یادەوەریە تاڵەکانم بیر ئەخەنەوە
باخی سێو
ئەسپی سپی
تەمتومانی سپی
سپی سپی لە سپێدە سپیەکاندا سپی ئەبنەوە
سپی بوونەوە ئەسپەکان لەسپێدەی سادەدا
دامێنە ساردەکان سینەی پڕ لە سەهۆڵیان
خستە سەما بۆ ئەسپە سپییەکان

## به دوای هیچەوە

به یەکەوە چووین زۆر دوور چووین زۆر
ڕمی سوارەکان بدۆزینەوە
بەڵام جگە لە کەللەو تاخمی ددان
هیچ شتێکی دیکەمان نەدۆزییەوە
به تەنها ماینەوە
هەریەکەو بە ڕێگەیەکدا ئەڕۆیی
کەسیش نەیئەزانی ئەو ڕێگایانە
کۆتاییان بە چی دێت؟

## دوورینەوەی ژیان

جەنگ هەموو کاسەکانی خەیاڵی شکاندبوو
جەوهەری هەموو ئینسانەکانی
بەناو خاکدا هەڵڕشتبوو
فۆرمی هەموو بیرکردنەوەیەکی تێکدابوو
ژنێ لە لێواری دەریا شکستەکانی ئەدوورییەوە
ورد ورد لەبەر ژیانی ئەکرد

## سووڕی جەستە

گەڵا گەڵا لە درەختی زمانم ئەوەرێ
دەمار دەمار لە شلکەی ڕانم ئەوەستێ
زێ زێ لە دەریای وجوودم ئەوشکێ
بۆ عەدەمم ئەبەنەوە
شیعر دێت و وەرین و وەستان و وشکی
ئەکا بە خوێنی ئەوین
گیانم زیندوو ئەکاتەوە

## ناشتنی کتێب

کتێبەکە تای ئەشقی گرت
لاوازی دەستی پێ شل کرد
ورد ورد پەڕەکانی زەرد ئەبوون و هەڵئەوەرین
چەند دەقێکی لێمایەوە
دەق لە تاو ئەوینی کتێب هێدی هێدی ڕەش ئەبۆوە
تەنها چەند ڕستەیەکی خەمگینی لێمایەوە
ڕستەکان تووشی ڕمان بوون
چەند وشێکیان لێمایەوە
وشەکان لە تاو تەنهاییدا تایێکی ئەبەدییان گرت
چەند پیتێکیان لێمایەوە دونیایان گەش ئەکردەوە
مۆرانەی بێمانایی هات بە گیانی پیتەکان وەربوو
چەند خاڵێکی ڕەش مایەوە
دواجار بای سڕینەوە هەڵیکرد
بۆ یەکجاری کتێبی ڕەش کردەوە
ئێستا زەوی بێ حیکمەت ئەسووڕێتەوە

## مەرگەسات

جەنگ تەواو بوو
لە ناو دڵی ژەنەراڵێ
کە سەری پڕ لە شەباقەی گوللە بوو بوو
نووسرا بوو ئیدی ئەگەڕێمەوە ، کچەکەم

## جانگی مرۆڤ

له قوڕی تاریکی گیر بوو بووم

دەستم بە شتێکەوە گرتبوو

زۆر توند بە زەوییەوە نووسا بوو

ئەو شتە مرۆڤ بوو

بەیانی زانیم مرۆڤ لە مردندا بە جەوهەرترە

## شەوق

هەندێ جار لە نێو خەوندا خەون ئەبینم
لە نێو شووشەی ئاودا بیابان ئەبینم
بۆ لوتکە ئەچم ئەگەم بە بنار
لە نێو دەریادا تەرمی شەپۆل و نەوڕەسی کەنار
لە نێو تابلۆدا مەرگی ڕەنگەکان
هەموو شتێ لە مەداری خۆی ترازاوە
تەنها تۆ نەبیت وەك شەوقی ئەزەل
وێنەکانت بە ڕۆحی منا چەسپاوە

## ڕاکردن لە دەست ژیان

ناچارین هەمدیس ئەو ڕێگەیە بگرنەوە بەر
کە بەرەو نا شت ئەچوو
با وەك كفنێكی سپی لولیداین
بەرەو گۆڕستانێكی بردین
کە هەموویان لە زیندوویی خۆیاندا رایانئەكرد

# شکۆڤەی ڕەش

ئێمەیان بردەوە لای ئەو زیلانەی
هەموویانی بە زیندوویی هێنابوو
وەك چەند بەتانییەکی لولدراو
تووڕیان هەڵداین
زۆرانێکمان دەستمان بە جێما
هەندێ قاچ و هەندێ ڕۆح
منیش یەکدوو پەنجەو چەند شیعرێکم

## بۆ تاوێك مەستی

له دوور دوورەوە
له ناو هەزاران تەرم كه شوێنی گوللەكان
وەك گوڵ شەباقەیان ئەدا و ئەبریقانەوە
وامزانی بەهار گەیشتووە
هاوارم كرد ئەگەڕێینەوە لای مەیخانەكان

## ئەبسورد

ئەمەویٚ تۆ لە دەست بکەم
شمشێر لە پیٚ
تەم لەبەرکەم
شەبقەیەك لە هیرۆیین لە سەرکەم
تا بۆ ئەبەد دیمەنەکان لە بیر بکەم
هەریەکەو خاچی خۆی داوێتە سەرشان و
شەرابی تراژیکی خۆی ئەخواتەوە

## زەنگەکە لێی نەدابا

ئەگەر نەچووبام تۆم نەئەبینی
تۆم نەبینیبا، هەرگیز تۆشم نەئەناسی
کە تۆشم نەناسیبا، گرفتار نەئەبووم
کە هۆگرت نەبوومایە، چاوەڕوانیم نەئەکردی
کە چاوەڕوانیم نەکردبای، شێت نەئەبووم
کە شێت نەبوومایە
بەردم نەئەگرتە پەنجەرەی ماڵەکان
کە بەردم نەگرتبا پەنجەرەی ماڵەکان
نەئەکەوتمە بەندیخانەکانەوە
کە نەکەوتبامە بەندیخانەکانەوە
ئەو کەسانەم نەئەناسی
کە ئەوکەسانەم نەناسیبا
تووشی کێشانی حەشیشە نەئەبووم
کە حەشیشەم نەکێشابا
بۆ ناو تەنهاییت نەئەبردم
کە تەنها نەبوام  ئاوا لە لە ناو دڵی بارەکان
لەسەر شۆستەی شەقامەکان
لەناو ساردی بەستەڵەکا بە تەنهایی نەئەمردم

## هەر یەکەو خۆی

لە ناو قەدی چیایەکی سەخت
کەڵێسا دەستی بەرز کردبۆوە و دوعای ئەکرد
منیش لە ناو کەڵێساکە دەستم شۆڕ کردبۆوە
یاریم بە گونم ئەکرد

## گەرداو

لەناو ڕەشەباکەدا تەواو تەواو ماندوو بووم
دەستم بۆ ڕۆحم بردو وەك کتێبێ دەرمهێنا
پەرش و بڵاوی هەر چوار کناری دونیا بوو
بێڕۆح لە نێو ڕەشەباکەدا مامەوە
تەنیا لاپەڕەی جەستەم مایەوە
کە پۆرتریتی خۆمی تیا بوو

## تەلانی ڕك

بایێکی شێت چارۆگەی کەشتیەکەمانی داگیرساند
کەشتیەکەمان وەکو مەلێکی سەربڕاو سەمای ئەکرد
ئێمەش لە ناو کەشتییەکەدا
وەکو منالّ ئەگریاین

## کوشندە

بۆ تاوێك لە گەڵ نەوڕەسەکانی کەنار
هەوڵی فڕینمدا
ئەوان بە باڵەفڕە گەیشتنەوە دەریا
منیش لە قومی کەناردا ڕۆچووم
زەمەن بێ ڕەحمانە بەلامەوە ڕەت بوو
سڵاویشی نەسەندمەوە

## وڕێنه

تۆ دەرگاییکی کراوەو داخراوی
سپی و رەشی، کپی و هاژەی
سیسی و گەشیی
بەیەکەوە بوون و جودای
تۆ هەم شەیتان و هەم خودای

## شووشەو نۆتە

سمیرنوف شیعرێکی شلی شینباوە
فلامینکو گڕی نەی
تانگو مەیخانەی دەنگە
سامبا دڵی کچێکی هەزار ڕەنگە
سالسا دەرزی ئاژنکردنی جەستەی جەنگە

## سوورِانەوەی ئەبەدی

باش وەکو دڵم تاکە خۆشەویستێکی هەبوو
هەتا ماوە بۆی ئەگەڕێ
تەنها من و تۆ ماینەوە ئەی با

## وەك ڕایەخ لوولیداین

ئەو کاتەی گەیشتین هێێشتاکە ژیان تامی مابوو
جارجارە ئەچووینەوە سەر گومەزی عاشقان
شوێن پێمان لەوێدا هەر مابوو
بەڵام ئاخ لەززەتێك لە ڕۆحماندا نەمابوو

## ئاسکی سپی

هەندێ بۆ ئەوە لە دایك ئەبن
لە بارەکاندا مەست ببن
یا لە کەناری دەریاکان
خەیاڵ بەسەر ئاوەکاندا ببەشنەوە
یا خەون بە ڕابردووی دوور  ببینن
هەندێکی تر بۆ ئەوە لەدایك ئەبن
تا ئاسکی سپی ئایندە لە نێو ڕەوەزەان ڕاو بکەن
منیش بۆ ئەوە لە دایك بووم
بۆ ئەبەد بە دواتا ڕاکەم و شوێن پێی ئەوینی تۆ بگرم
یا لە گەڕان بەدوای شەبەنگی هەزار ڕەنگی تۆدا بمرم

## له دوو لا

هەست ئەکەم تۆ بچووکترین مەخلووقاتی
بۆیە هەمیشە نادیاری
هەست ئەکەم تۆ گەورەترین مەخلووقاتی
بۆیە هەمیشە دیاری
بچووك بی یاخود گەورەبی
دیار بی یاخۆ نادیار
ئەوەمنم ئەکوژێمەوەو دائەگیرسێم
ئەی تاقانەترین مەحاڵ

## دەریا دەریا و ڕێگا ڕێگا

که سواری قایغەکه بووم تازه دەریا
شەپۆلەکانی بانگی سەر سینەی خۆی کردبوو
تازه شەوی درێژ  بەیانی بانگ ئەکرد
من بیرم لەوانه ئەکردەوە
بەر له من ڕۆیشتن بەڵام هەرگیز نەگەڕانەوە
ئایا هەموو شتێکیان له گەڵ خۆیاندا برد ؟

## له چاوەڕوانی تیشکدا

قیتارەکە خێرا
خێراتر لە دڵی مایسترۆمانەکە لێیئەدا
دڵی مایسترۆمان خێرا
قیتار خێرا
منیش لە کەنار ڕووباری ئاڕنۆ لە سەرخۆ
بە هێمنی چاوەڕوانی فێرژیلم ئەکرد
من و دانتی بە یەکتری بناسێنێ

## نۆستالگیا

دەریای سپی ناوەڕاست
وەك كراسی سپی هەور
تەڕ تەڕ دەماری دڵی ووشك ئەكردمەوە
من ئەو كاتە غەریبی دەشتاییيەكانم ئەكرد
زۆر زوو پێكێ درای جن منی ئەبردەوە
جۆبارەكانی هیرتێ

## زێڕی شیعر

به شاعیرەکانی دەوروبەری خۆم گوت
شیعر وشه نییه
زێڕێکی تایبەته
یانی مەعدەنه مەعدەنی ڕووت
تەنها قەرەج به جوانی له ددانیان ئەنێ
من بێ ئەو تایبەتمەندییه
ناتوانم شیعر بنووسم
تووڕە بوون
زانیم ئەوان پەیوەندییان به شیعرەوە نییه
بەڵام ئەیانەوێ بنووسن
با بنووسن

## شەرابی خراپ

شاعیرە خراپەکان وەکو ئەوانەن
سێکس لە گەڵ مەعشووقە مردووەکانیان ئەکەن
ئیدی سواری زەینی مردووی خۆیان ئەبن
ئەوان ئەیانەوێ بگەن بە ئۆرگازم
ئۆرگازم ملیار شێوەی هەیە
بەڵام  تەنها شیعر شێوەیەك نییە لەو شێوانە

## قەدەرنووس

گەڕام  زۆر گەڕام بە دوای چارەنووس
هەندێجار لە بنی دەریا بوو
چوومە بنی زۆر دەریایان، چارەنووس لەوێ نەبوو
وتم ئەبێ لە تەلان و هەڵدێران بێ
چوومە لوتکەی زۆر چیایان، چارەنووس لەوێ نەبوو
بیرم کەوتەوە چارەنووس لە ناو دڵی کتێبدایە
کتێبی هەموو کتێبخانەکانم خوێندەوە
چارەنووس لەوێ نەبوو
کتێبێ لێیدامە دەنگ و گوتی بگەڕێ زۆر بگەڕێ
چارەنووس لە نهێنی دێڕەکاندایە
دێڕەکانم یەك یەك تەیکرد، چارەنووسم لەوێ نەبوو
دێڕێ نەرم، زۆر بە نەرمی چرپاندیە گوێم و وتی
چارەنووس لە ناو ڕۆحی وشەدایە

وشە نەما بە داوی بیرمەوەی نەکەم

چارەنووسم لەوێ نەبوو

وشەیێ ئەتووت قومرییە

وتی بگەڕێ زۆر بگەڕێ

چارەنووس لە شەفەقی پیتێ دایە

پیتەکانم شەن و کەو کرد، چارەنووس لەوێ نەبوو

لە هیکەوە م ، ە، ر، گ هاواریان کرد

لێکماندەوە تۆ بە پەلەی

تا تێبگەی ئێمە ڕاستین یا تۆ هەڵەی؟

## تازە لە دەریا ئەهاتمەوە

هێشتا سیڕەی نەورەسەکان لە ناو دەمارەکانما
بە چەشنی لەشکرێکی شێت تاویان ئەدا
باسی پیاوە خنکاوەکانیان ئەکرد
ڕشتێ هەناسەی خنکاو دەستی مەلەوانەکانی گرتبوو
چەند دەنگێکی نووساو کۆمەڵێ ئاوازیان دیل کردبوو
هەندێ شەوقی خنکاو کەونیان خستبووە سەر لەپ
چەند دێڕێکیش لە عەڕڕابەکە جێمابوو
تەرمی شیعرییان هەڵگرتبوو

## پەراوێزخراوەکان

هاواری خنکاوەکان لە گوێما دەنگی ئەدایەوە
نەرمە شەپۆلێکی دانووب و چەند دڵۆپە ئاوێکی
قەوقازی
بەسەر پەڕەی گوێمەوە هەر مابوون
چەند دانە مرواریێکی شاژنی دانیمارك
کە شکسبیر لە شانۆگەری هاملیت دا
لە گەردنی دایکی بینی بووی
لە گیرفانما بەجێمابوو

## سەفەر بە سەر پشتی بادا

بای ئەبەد هێندە منی دوور بردبوو
جگە لە حووتەکان کە جار بە جار سەریان دەرئەهێنا
کەس سەدای منی نەئەبیست
کە وەك شووشەی ئەڵماس ئاوی دەریای ئەبڕی
دونیا چۆلتر بوو لە ڕۆحی ئەخاب
سامی دەریای گڕگرتوو
ئاسمانی شەق ئەکرد

## شکانی مەرکانەی وەهم

مەوەستە پێت وابی بە وەستان
سێوی ئامانجی خۆت ڕنیوە
ئەوانەی ئەوەستن
واهیمەی گەیشتن کەڕو لاڵی کردوون
ڕامەکە پێت وابێ بە باڵی ڕاکردن
فەرشی جوانیت لە باخی شیعردا چنیوە
ئەوانەی کە وەستان لە قووڕی مێژوودا چەقیوون
ئەستەمە بتوانن دەستیان لە جوانیی گیر ببێ
ئەوانەیش ڕایانکرد
شتە جوانەکانییان لە دوای خۆ بەجێهێشت
ئێستێکە بێ کەرەستەی جوانی لە سنووران کەوتوون
پەشیمانی لە نێو سەریاندا پیر بووە
کە جوانیت مەبەستە مەوەستە
جوانیی زۆر دوورە لە تاجی پڕ شکۆی دڵتایە

ڕامەکە بتەوێ نەمریی بە دەست بهێنی
گلگامێشێکی زۆر لەو ڕێیە تەمەنیان نایەوە
نەمریی لە پەڕەی نزیکترین گوڵدایە
تۆ سووکە ئاوڕێ بدەوە ئەزانی
بە هەزاران لیرەی جوانی شیعر
لە دوای خۆت جێمایە

## که مەرگ منی کڕی

شەو بوو مانگ کەوتبووە دەست چەتەی ترس
ئەستێرەکان لە ناو زیندانی ئاسماندا ئەیانناڵاند
ڕێگاکان بە قفڵی مەینەتی کلوم درابوون
دڵی منیش بە فیراق مەرگڕێژ کرابوو
ئەو شەوە درێژترین شەوی ژیان بوو
ئەو کات دواجار بوو لەو ڕێگایانەدا
تەوقەم لەگەڵ مەرگ کرد
یەکەمجار بوو ڕۆحی خۆم فرۆشتە شەیتان

## هاودەم

نەوڕەسەکان فڕین و من بە تەنها مامەوە
ئەو ڕێگایە چەند لە مار ئەچێ
تا دێ درێژ ئەبێتەوە
وەك مار، وەك شەوێکی قەترانی
بۆ ناو زەینی من هەڵئەچێ

## دیلکردنی جوانی

ئەو ڕێگایەی منی ئەبردەوە نادییاری
جوانترین مانتۆی ئاشکرایی لەبەر بوو
ئەوەی منی لە تۆ جیا ئەکردەوە
نامەی بەیەك گەیشتنی ئەنووسی

## پارادوکس

چەند سەیر بوو
تاوێرەکانی سەر ڕێگا ئەتەقینەوە
گوڵەکانیش لە بن تاوێرەکان ئەپشکووتن
وەك مردنی من و دەرکەوتنی تۆ

## قاسەی جوانی

زەمەن پڕە لە ئاگر منیش لە ئاو
پڕە لە حەکایەتی مردن
منیش لە میهر
پڕە لە لوورەی گورگ
منیش لە ئاواز
پڕە لە وەڕەسی
منیش لە شیعر

## تاتۆ

بەر لە هاتنم هەزاران شەوق و شینت بۆ ئەناردم
قاسەی سەرت لە هەزاران جێ ئەشکاندم
یوتیپێکی چەند ڕەنگین بووی
وەك تاتۆی سەر پشتی پڵنگ
سام و جوانیت ئەبەشییەوە
دوای هاتنم لە ناو زەمانت شاردمەوە
مردنت هێندە زۆر کردم
بووم بە ڕستەی نێو کتێبی ئەشقیاکان
دەمێ نەبوو هەزاران جار نەمرمەوە

## فڕین

قسە بکە ئەی وەڕەسی
تۆ چەند لاڵ و بێدەنگی
خۆت بنوێنە  تۆ ئاوێنەیەکی چەند تەڵخی
شمشێرەکەت بخەرەوە کاڵان
ئەڵێی پاڵەوانەکانی سامۆرایی
دەستت لە سینەم دەرێنە ڕۆحم نادۆزیتەوە
سەیری کە چۆن  لە نێو ئاسماندا هەڵئەفڕێ

## له پێکەوتنی زەمان

ساتێکی کورت، کورتتر لەم ڕێگە درێژانە تۆم بیرکەوتەوە
بروسکێکی جگەربڕ، سەدان جار لە سەر یەك کوشتمی
گریام و زۆر گریام دلۆپێ چاوی تەڕ نەکردم
هیچ کەسێ پەی بەوە نەبردووە
کە مردن ئەوەندە شیرین بێ لەو ساتەی
کە زەمەن لە دەورت مردووە

## مانەوە لە قووڕی ئەبەد

بیرم لەوانە ئەکردەوە  پێ بە پێ لە گەڵ منا بوون
نە ئاسمان  ڕایئەگرتن و نە گۆی زەوی
ئەوان چوونەوە ناو درزی وجود
منیش لە ناو دڵی تەنهایی ئەبەدیدا مامەوە

## دڵ

تۆپی ئاسۆ وەك پەڵە خوێنێکی تۆخ
کەونی سوور هەڵگەڕاندبوو
بۆ ناو ئەبەدی نادیار گلۆر ئەبۆوە
دڵی خۆم بیر کەوتەوە چۆن بێهوودەیی ڕایئەدا
ئێستا نا ئێستا لە سینەم ئەترازێ و ئەکوژێتەوە

## به با چوون

هەزاران هەزار میل لە ڕێگا
وەك كاغەزی چینی دڕابوو
بایێكی توند بە تەبەشی من بڕا بوو
وەك شمشێر ئەیسمیم
ئێستاش بەرەو نادیاریی ئەمجمێنێ
من دڵی خۆم دایەوە بەوەی دوای كەمێكی تر
مەرگ ، ئەو زەیتوونەی بە تاسووقەوە چاوەڕێی ئەكەم
لە زینی ئەسپ دامئەگرێ و ئەمڕفێنێ

## دابەزین لە ژیان

لە پاسی ژیان دابەزیم
خۆم لە چرکەیەکدا بەستایەوە
تەنهاییەك لوولیدام لە مارێکی ئاشق ئەچوو
زەمانم کەوتە لەرزەو زمانم لە گۆ کەوت
کەون وەك زیندانێکی تاریك بوو
منی تیادا تاکە دیلی سەر زەمین بوو

## تارومار

جوانترین باڵم
لە باخچەی مەلەکاندا بۆ هێنابوو
جوانترین ڕەنگم
لە پەڕی تاوسدا بۆ کڕی بوو
جوانترین شەوقم
لە نووری شاعیراندا بۆ دزی بوو
جوانترین دەنگم
لە گەرووی شمشاڵدا بۆ چڕی بوو
جوانترین لوتکەم
لە ڕەوزان بۆ تاجی سەری هێنابوو
جوانترین باقە گیام
لە گوڵستانی شیرازدا بۆ چنی بوو
جوانترین باوەشم
لە دڵەوە بۆ هەڵێنابوو

بەڵام باڵەکانی شکاندم و
ئێستا فڕینم نەماوە
ڕەنگەکانی ڕشتم و
ئێستا دونیای من بێڕەنگە
شەوقەکانی کوژاندمەوە و
ئێستاکێ لە تاریکی ئەژیم
دەنگەکانی کپ کردم
توانای گۆرانی لێ کوشتم
ئەو لوتکەیش کە هێنابووم
دایڕماندو ئێستا من تەنها دامێنم
تەڵ تەڵ گیاکانی سیس کردم
ئێستا من لە ناو پاییزم
باوەشی پڕکردم لە تەنهایی
ئێستا تەنهاترین کەسم

## ستەم

ژیان هەموو شتێکت لێ ئەسەنێ
تەنها شتێ کە ئەیبەخشێ کورتە سێبەرێکی مەرگە
تا دوا هاوارو هەناسە بە دواتەوە ئەخشێ
خششششششششششش
دونیا کپ هەڵئەگەڕێ

## دوا هەناسە

جار جار لەو تاریکستانە ئاگراوییەی ڕێگەدا
شەبەنگی تۆم ئەبینی ڕەنگەکان کاڵ ئەبوونەوە
بە ئاستەم لەو سەری دونیا بۆ لای من تەکانت ئەدا
منیش شەختەی ڕێگە ئێسقانی ڕەش کردبووم
ئاگادار بووم دوا هەناسەم ئەدا

## شکان

ڕێگا هەزار دەرگای داخراو بوو
مەحاڵ وەکو قومری شین ئەچۆوە
پۆڵا بوون سارد ئەبوونەوە
دڵم گوێزێکی شکاو بوو

## سڕانەوە

سەرم خاڵی بوو لە خەیاڵ
پێم لە زەوی بەردابوو
دەستم بە با گرتبوو
سەرەتام بەرەللا ئەکرد
کۆتاییەکانم دائەخست
یەکەم جار قاچم کەوت
دووەم جار چاوم شلبوو
زانیم لە زەمین ڕەش ئەبمەوە

## تەنها شیعر

ڕۆح لە نێو ئاسێ ترین قەڵای شیعردا ئەلەرزی
لەرزینێ لە ڕامانی فیل ئەچوو
کە ئەکرایە قوربانی خواکان
لەرزینێ لە شەوی درێژی ئوفیلیا ئەچوو
کە شەپۆلی دەریا بەسەر تاشەکانەوە ئەی هاڕی
هاوارم کرد ئەی شیعر فریام کەوە
من بێ خەیاڵترین ئینسانم
لە نێو ئەم زەوی و ئاسمانەدا
خەمگینترین وشەی ناو فەرهەنگی زمانم

## کاستێلیا

کە بە تەلانی ڕێگاکەوە شۆڕ بوومەوە
تازە لە کتێبی ئاوابوون بووبوومەوە
پاڵەوانەکان یەکە یەکە لە ناو کتێبە سیحراوییەکە
ئەهاتنە دەرەوە و لە گەڵ مندا بە ڕێئەکەوتن
ئەوان بەر لە من پێکی دژوارییەکانیان هەڵدابوو
ملی سەدان بوتڵی مەینەتیان شکاندبوو
بەر لە من بە چەکی بێ ئامانی هاوار
کە ئاسمانی کون کون کردبوو
لە گەڵ لەشکری تەنیایی جەنگا بوون
بەر لە من لە ناو ئاپۆڕەی ژنە ڕووت و قووتەکان
لە ناو ئاگری شەهوەتە شەیتانییەکان
تەنهاترین تەنها بوون
یادەوەرییەکانی خۆیان لە خانەی سەر حەشاردابوو
بەڵام بە درێژایی ئەو هەزار ساڵەی نێو ئەو ڕێگا
نادیارانەی
ئێمەیان ئەبردەوە سەر دەریاچەی کاستیلیا
هەرگیز ورتەیەکیان لێوە نەئەهات و
بزەیەك گەشی نەکردنەوە

## بازنەی هەرهەری

خۆم بینی منیش دوای کەمێکی تر
ئەگەم بەوانەی تازە ملی ڕێگا ئەگرن
ئەوانیش وەك چۆن من
بۆ پاڵەوانەکانی کتێبی سەفەری ئاوابوون
یادەوەرییەکانم تۆمار ئەکرد
لە دەفتەری کەوناری هزریان
هەمان یادەوەری بۆ من ئەنووسنەوە

## به درێژایی کتێبی ڕێ

ڕێگایەکان هەر یەکەو دەنگی خۆی هەبوو
دەنگی شکان، دەنگی وردوخاشبوون و ڕمان
مێژووی درزی دڵی ئەم کەونەیان ئەگێڕایەوە
جیاوازی نەئەما لە میانی بەرد و ئینسان

## دەنگ

دەنگی تۆ لە ئاوەوە دێت ئەزانم
بۆنی هەموو ئاوەکانی هەڵگرتووە
چونکە کە ئەگەیتە ئاوەکان هەموو ئاوەکان ئەوەستن
ڕەنگی تۆ لە بایەکانەوە هاتووە
ئەزانم شەوقی هەموو دارستانانی گرتووە
ئەبینم کە بەتەك دارستانەکانەوە دێی
گەلا هەمووی سەما ئەکا
تۆ کە ئاو بیت ئەبی هەمیشە هاودەمی خنکان بم
تۆ کە بابیت ئەبێ هەمیشە هاودەمی دارستان بم
ئێستاش کە ئەچمەوە سەر ئاوەکان
باسی تۆم بۆ ئەگێڕنەوە
کە ئەڕۆمە دارستان باسی تۆم بۆ ئەگێڕنەوە
کە بمەوێ هەزار ساڵ ئەندێشەت بکەم
خۆم ئەخەمە بەر ئاوەکان
کە بمەوێ دارستانەکان تەی بکەم
خۆم لە بایەکان لوول ئەدەم

## زەمەنێکی ئاڵۆز

کە هەموو ڕێگاکانمان بڕی و وجودی بێماناى خۆمان
وەك کیسەیێ ئێسقان
لە دوای خۆماندا بە جێهێشت
وەك چەند قەپێلکێکی بۆش لە ناو سووڕی زەماندا
لە مرۆڤ نەئەچووین
لە تەونی ڕۆژگاردا مەسخ بوو بووین
بووبووین بە حەرفێ
لە کتێبی ڕەشی هەرەس و داڕمان
بووبووین بە خۆڵەمێشیی ناو کتێبی سپی زمان

## لەوێ یەکتر ئەبینینەوە

ئەو دەمەی بیر کۆیلەو جەستەمان شەق شەق و
دڵیشمان کون کون بوو
ئەو دەمەی زمانمان سووتاوو ناولەپمان خاراوو
ئاسمانمان دڕا بوو
بیناییمان شێلو و پەنجەمان یەك یەکەلە ناو دەمی
چەقۆدا بڕا بوو
ئەو دەمەی ئاسۆمان تاریك بوو
ڕێی ئاوات وەك سیرات باریك بوو
هەمووومان لە دۆزەخ ئەسووتاین
بۆ بۆنی بەهەشتی خاکمان ئەگریاین
ئەو دەمە بە هێمای دەست و چاو
بە دڵی پر برین بە هیوای بەجێماو
پێم گووت لە وێ لە دەرسیم یەکتر ئەبینینەوە

## مرۆڤی زیادە

هەموومان وەك كۆمەڵە مەستێكی شكاو
لە تەلانێكا وەستاین
كەس نەیئەزانی ئێمە چین و لە كام قەڵەمڕەوی
خوداین
كەس نەیئەزانی كە ئێمە
لە چەند تارماییەكی بێزەوەرین
لە ناو هەندەسەی قەدەرێ
چەند لە یەك ئەچین و جوداین
بەچی خۆمان بگرینەوە

## بەچی خۆمان بگرینەوە

با وا بیر نەکەینەوە هەین
کە سەر زەوی بەشی پێکەوە بوون ناکات
با نەڕۆین کە ڕۆژنەی زەوی
بەشی چاومان ناکات
بابیر کەینەوە کەوا هەین
هەتا جوانی فەزای بوونمان پڕ کاتەوە
شەونم پڕووشەی شەراب بێ
گرێی دڵمان بشواتەوە
بابیر کەینەوە کەوا هەین
تا ئێمە پارسەنگی بوون بین
لە پانتایی ئەم کەونەدا وەك بەندۆلی خۆشەویستی
بۆ تا ئەبەد من بەرەو تۆ تۆ بەرەو من
هەمیشە لە هاتوو چوون بین

## چەردە

بە ناو ڕێگاکاندا ئەڕۆیشتم
درەختەکان قسەیان بۆ ئەکردم
بەردەکان قسەیان بۆ ئەکردم
بۆقەکان قسەیان بۆ ئەکردم
کە بە ناو مرۆڤەکاندا ڕەت بووم
بەردەوام تەقەیان لێ ئەکردم
زانیم دار و بەردو درختەکان
چەند ئینسانی ترن لە ئینسان

## ئاوی سپی

وەك ئاسكێكی شین
كەوتیە گلێنەی چاومەوە
ئای چەند سپی ئەچیتەوە
هەر ئەلێی تیشكی بەسەر ترێی رەشی بەختمەوە
چەند پڕ نووری هەر ئەڵێی تریسكەی ئاوونگی
بەسەر باقە گیای بووڼمەوە

## بێتام بوونی ژیان

ئەو ڕێگایانە چەند درێژ بوون
هەناسەکانی منیش چەند کورت
چەند ڕووناك بوون و چاوەکانی منیش چەند کز
باسی نهێنی منیان ئەکرد
کە من لە ئاشکراییدا غەرق بووبووم
ئەو ڕێگایانە وەك کتێبی مردووان وابوو
کتێبی بێتامی ژیان

## شەکەتی

چەند ماندووم لەو ڕێگایانە
کە پرسیارن لە ئێستەتیکای کات
چەند ماندووم لەو ڕێگایانە
کە وەڵامن لە ناشیرینییەکانی شوێن

سەردان
ئەچمەوە سەر ئەو یادەوەرییانەی
لە ڕەشەبادا لێم ڕژان
ئەو فرمێسکانە کۆ ئەکەمەوە
کە بەسەر تاوێرەبەردو گیادا
وەك پرووشەی باران پژان

## تەوقی گەردن

ئێمە هەموومان بەو ڕێگایانەدا ئەڕۆین
کە وەك ناواخنی کتێب وان
هەموو ئایدیاکانی ئینسان
بە وردوخاشییەوە لەناو ڕێگادان
ڕێگاکان زیندانی خودان
لە زیندانی مرۆڤ ڕەشتر و هەم جودان

## ئوڤیلیا

لەرزینێ لە ڕامانی فیل ئەچوو
کە ئەکرایە قوربانی خواکان
لەرزینێ لە شەوی درێژی ئوفیلیا ئەچوو
کە شەپۆلی دەریا بەسەر تاشەکانەوە ئەیهاڕی
هاوارم کرد ئەی شیعر فریام کەوە
من بێ خەیاڵترین ئینسانم
لە نێوان زەوی و ئاسماندا
خەمگینترین وشەی ناو فەرهەنگی زمانم

## جێگۆرکێ

له دڵی ڕێگاکاندا گیام بینی تەنها
بەڵام شەونم لەسەر بەردەکان کەوتبوو
درەختەکانم بینی تەنها
بەڵام گەڵا بەسەر ئاو کەوتبوو
ڕێگاکان له هەوا بوون و زەویەکانیش بێ ڕێگا

## خوێنی تاڵ

ڕێگاکان پڕ کۆبرابوون
ئێمە بە دوژمنمان ئەزانین
ئەوان بۆ نیشتیمانی خۆیان ئەچوون و
عەودالّی گەیشتن بوون
ئێمەش بەرەو کوشتنیان ئەچووین و
عەودالّی خوێن ڕشتن بووین
ئەوان گەیشتن و بەلاّم ئێمە نەگەیشتین
خوێنمان پڕ ژەهر بوو

## گەڵای سپی

زوو یا درەنگ ئەوەی نامەنەوێ بێ دێ
زوو یا درەنگ ئەوەی ئەمانەوێ نێ دێ
ڕەنگە من بچمە ئایندە و تۆش بچیتەوە ڕابردوو
یاتۆ سەفەر بۆ ناو لیمی کەنار بکەی
یا من سەفەر بۆ ناو تەمی بنار بکەم
زوو یا درەنگ ئەچینەوە بۆ منالّیی
شەونمی ڕوونی تەنهایی
سپێدەمان پڕ لە شەوق و کپی ئەکا
ئەوین دێت و سترانی خۆی هەڵئەڕێژێ
تەوقی سەرمان پڕ لە گەڵای سپی ئەکا
زوو یا درەنگ هەموو شتێ لە فەلەکی خۆی ئەترازێ
پاشا لە تەخت و کورسی خۆی
دەرگا لە چوارچێوەی جوانی، دەریا لە ئاو
مەل لە جریوە، سەرخۆش لە مەی
ساقی لە بەزمی جۆش و خرۆش
دارستانیش لە دەنگی نەی
ئاخ دڵی من و دڵی تۆش

## خۆكوشتن

له ناو چەقی ئەو ڕێگایانەی
ئێمەیان ئەبردەوە ناو زیندان
یەکە یەکە باڵندەکان خۆیان ئەکوشت
گریاین خۆمانمان بیر ئەهاتەوە
کە لەو ڕێگە بێ کۆتاییانەدا
ئێمەش یەکە یەکە خۆمان ئەکوژین

## قومار

چەقۆمان پێ نەبوو
شریتی ئەو ڕێگایەنەی پێ ببڕین
ناچار بە پێ بڕیمان
هەموومان کەوتینە داوی مەحاڵ
بۆیە پەنامان بردەوە بەر یاری قومار
دۆڕاندمان، دۆڕاندمان
ڕووتبووینەوەو دەمانزیڕاند وەکو مناڵ

## ئەلفابای گومان

لەناو ڕێگاکاندا
هەزاران جام شەرابم هەیە
شەرابی هات و نەهات
هەزاران کتێبم هەیە
دەربارەی زیندانی زمان
کە با هەمووی کۆکردنەوە
کردی بە گەورەترین کتێبی
ئەلفابای شێواوی گومان

## نووسینەوەی یادەوەری

کە گەیشتینە دوا سنوور
زمان لە گۆ کەوتبوو
چراکان تازە کتێبی سەمایان ئەنووسییەوە و
خۆیان ئەکوشت
تازە بخوردی کێلی زیندان ئەدرەوشایەوە
مەل ئەگەڕانەوە لە فڕین
باڵی شکاوی خۆیان بە با ئەبەستایەوەو
قەدەری خۆیان دابووە دەست جریوەو چڕین
من لەوێدا بە پەلە یادەوەرییەکانی خۆم نووسییەوە
مابوو بگەم بە ناخی خۆم
کە کتێبی بێهوودەیی بانگی کردم
لەو ناوەدا وەك شمشێر لە با چەقیم و
بۆ ئەبەد نەبریسکامەوە

## تیری بەر کەوان

کتێبەکان ڕێگایان بە ناوەرۆکی خۆیان گرتبوو
ئەو دەم خۆشترین ساتی ژیانم بوو
خوێنەرەکان لە ژێر باڵی کتێبەکان خەوتبوون
ڕێگا پڕ بوو بوو لە شەیتان
پەیمانێکی فاوستی بوو
لە میانی کتێب و ئینسان

## نامە

بیر لە من مەکەوە ئەی یار
من کوژاوەیەکم لە شەوقی دڵی کەرت بووم
داگیرسانێکم لە تونێل
شەوێکی درێژم لە ئازار

## تەنها خۆکوشتن

تونێلەکان منیان ئەبردەوە ناو تونێلەکان
ڕێگاکان تونێل تونێل بوون
هەرگیز کۆتاییان نەئەهات

## ئەوەی کەس نایبیستێ

سپێدەیەك شەفەقی خۆڵەمێشی
ئەڕژانده ناو دڵی ڕێگاکان
که هەم پرسیار بوو هەم وەڵام
له کوێی ئەی یار که دڵم وا کەرت کەرت ئەبێ
له نێوانی ڕاستی و گومان

## تینوێتی

ئێستا مێروولەیەکی برسیم
لەو سەری ڕێگا وەستاوم
سەگێکی تینووم
زمانم لە باڵام درێژتر لەدەم هاتۆتە دەر
هانکە هانکم کەونی وڕو کاس کردووە
ئەپرسم ئاخۆ کێ منی وا مەسخ کردووە؟

## درکاندن

من بوونەوەرێکی زیادەم
ڕێگاکان پێیان وتم
تەونێکی ماناسزم
فەرشی ڕێگاکان پێیان وتم
من کەوانێکی بێ تیرم
نێچیری ڕێگاکان پێیان وتم

## جەمسەر

هەمیشە ڕێگەیەك هەیە دێتەوە لای تۆ
ڕێگەیەك هەموو شوێنپێیکانمی بەسەریەوە دیارە
ڕێگەیەك هەموو فرمێسکەکانمی بەسەریەوە ڕژاوە
ڕێگەیەك هەموو هاوارەکانمی لەناو داگیرساوە
ڕێگەیەك هەموو ئەوینمی تیا دایساوە

## دارستانی من

وەکو مافور هەمووی تەونی تیرو دڵە
هەموو منارە ڕماوەکانی خەونی منە
هەموو باخە سیسەکانی هەناسەی منە
هەموو گەڵا وەریوەکانی ڕۆحی منە

## کەوتنە خوارەوە لە زەمان

بێدەنگی زەمانی پڕ سامی ڕێگە بوو
ئێمەش هەر هاوارمان ئەکرد
بەڵام نەمانتوانی شەختەی بێدەنگی ڕێگە بشکێنین
ئێمە شکاین ورد و خاشبووین
هەمدیس ڕێگە زەمانی خۆی نەگۆڕی
بێدەنگی بۆ ئەبەد داگیری کردین

## تاریکییەکانی ڕووناکی

دڵۆپ دڵۆپ ڕووناکی ئەچکایە لێوم
ئەبوو بە دەفی ڕووناکی
جۆگە جۆگە ڕووناکی ئەخزایە خوێنم
ئەبوو بە خەزنەی ڕووناکی
کانی کانی ڕووناکی ئەڕژایە چاوم
ئەبوو بە کوانووی ڕووناکی
ڕووبار ڕووبار ڕووناکی ئەپژایە دڵم
ئەبوو بە ماڵی ڕووناکی
دەریا دەریا ڕووناکی ئەتکایە گیانم
ئەبوو بە نەوای ڕووناکی
دواجار بووم بە ڕووناکی
ئەو هەموو ڕووناکییە تۆ بووی
ئەی خۆشترین کتێبی من
وەك شەبەنگێ هاتی

لانەت لە مەلەكووتی من دانا و نەهاتییەوە
ئەو هەڵچكانە بڕایەوە
بوو بە حەكایەتێكی دوور
ئەو هەڵخزینەوەش وەستا
بوو بە وێنەیەكی كۆن
ئەو هەڵڕژانە تەواو بوو
بوو بە سەرابی بیابان
ئەو هەڵپژانە خامۆش بوو
وەك یادی بێ وێنەی سەما
ئەو تكانەوەش چكی كرد
نە ئاماژی ما نە سەدا
ئێستا منم لە نێو كێڵگەیەك تاریكی
تەنهاترین كەسی تەنها
ئاسێ بووبێ لە نێو تاریكی و ڕەشەبا

## ئاسکی سەوز

تەواو لە ناو گلێنەی هەر دوو چاومایە
ئەزانم ئەو ڕێگەیە هەمان ڕێیە
کە هەزاران جار وەك کۆچەر پیا تێپەڕیوم
بە ئاسکی گیاکانی ئەیناسمەوە

## ئاوابوون

ئەو ڕێگایەی هەمیشە دێتەوە لای تۆ
پڕە لە قوفڵی کلیلدراو
پڕە لە تەڵەی برینی مەلی لە ڕەوە بە جێماو
پڕە لە شەوەزەنگ و زریان
ئاخ ئەو ڕێگایە پڕیەتی لە دەنگی گریان

## خۆکوژی

هەوڵێکی زۆرم دا
بە چەند وشەیێ خۆم بکوژم
کەچی وشەیەکی زۆرم کوشت و هەر نەکوژرام
زۆر هەوڵم دا
دژمنێ بۆ خۆم دروست کەم
بەڵام لە خۆم زیاتر کەسم نەدۆزییەوە

## دایکم

چەند غەریبیت ئەکەم دایە
کە هەزاران هەزار ئاخم لە دڵدایە
گیای سەرگۆڕەکەت زەرد هەڵگەڕاو هەر نەهاتم
وای من چەند بێ مانام خودایە

## شلبوونی باڵەکان

ئەبینی پیتی پڕ مانای کتێبەکان
هەتا دێ ورد ئەبێتەوە
چاوی منیش کزو کزتر
ئەبینی لەرزی پەنجەکان
هەتا دێ خێراو خێراتر ئەبێتەوە
تەختەی کۆمپیتەریش تا دێ
ئاڵۆز و ئاڵۆزتر
ڕێگا تا دێ درێژ و درێژتر ئەبێتەوە
هێزی منیش کورت و کورتر
فریام کەوە وا باڵی فڕینم ئەکەوێ
مەلی ئەوینیش هەتا دێ
بەرزو بەرزتر ئەبێتەوە

## جادو

زۆرجاران هەست ئەكەم ئاونگی
کە پێت ئەگەم شەڵاڵی گیا ئەبم
زۆر جاران هەست ئەكەم تۆ گیای
كە بە دەست ئەتگرم سەوز ئەبم

## ونبوون لە رووناهی

نەمئەزانی تۆ لافاوی
تا دواجار لە  ناو دڵتا خنكام
ئیدی بۆ ئەبەد من كوژامەوە
نەمئەزانی تۆ بەختەوەریت
تا دواجار لە خۆشیتا سووتام
ئیدی بۆ ئەبەد داگیرسامەوە
نەمئەزانی تۆ شووشەیت
تا دواجار لە بینابیت شكام
ئیدی بۆ ئەبەد لە رووناكیدا نوقم بوومەوە

## شەبەنگ

ئەوەندە بیر لە تۆ ئەکەمەوە
توانای نووسینم نەماوە
کە بمەوێ بتنووسم
لە ژێر قەڵەمما ڕائەکشێی
کە بمەوێ وێنەکەت بکێشم
نازانم ماهیەتی تۆ چییە
لە پەڕی فرشەما ئەبیتە هەزار ڕەنگ
من توانای یەك ڕەنگی تۆم نییە
ئەی هەموو ڕەنگەکان

## لە بووئمای

چەند دووری ناتگەمێ، کەچی وای لە دڵما
چەند بەرزی ناتگەمێ، کەچی وای لە لەپما
چەند سپی ناتبینم، کەچی وای لە چاوما
چەند سووری ناتبینم
کەچی وای لە خوێنما

## ئەچین لە ئاوی هیرتێ ئەخۆینەوە

کە لێرەین ئەوە لەوێ چاومان لە کۆترەکانە
چۆن لە ئاوی سەر بەردەکان ئەخۆنەوە
کە لێرەین ئەوە لەوێ دڵمان داوە بەو کچانەی
بەردەکان بۆ شوورەی خۆیان ئەگوازنەوە
کە لێرەین ئەوە لەوێ دەستمان لە ناو ئەو دەستانەن
شیری ژیان ئەبەشنەوە
کە لێرەین ئەوە لەوێ ڕۆحمان داوە بەو کەڤرانەی
لەبەر شیلەی گەرمی ڕژاو
مانگە شەوان وەکو زیو ئەبریقێنەوە
لە گەڵ یەکەم تریقانەوەی گوڵە پونگی سەر ڕێگاکان
ئەچین لە ئاوەکەی هیرتێ ئەخۆینەوە

## دەرکراوەکان

له ناوەندی زەمین و ئاسمان
بە هەڵواسراوی ماینەوە
نەمانئەتوانی نە بۆ خودا بەرزبینەوە نە بۆ شەیتان
نە ئاسمان بە هی خۆی ئەزانین نە زەوی
بۆ ئەبەد لەو فەزایەدا سووڕاینەوە
ئێستاش هەروا ئەسووڕێینەوە

## تۆ چەند سپی ئەچیتەوە

بەم درەنگ وەختەوە چی تۆی هێنا
ئاوا وەك تیشكی بلوورین
لە ژووری ئەبەنووسی منا بەدەركەوتی؟
كە من وا خەریكە وەك بازنەی ئاسۆی ئەبەدی
گلۆر ئەبمەوە
بەم درەنگ وەختەوە چی تۆی هێنا
ئاوا وەك شەوقێكی كەونار
لە خەرەندی قووڵی رۆحما بەدەركەوتی؟
كە من وا خەریكە لە تەلانی ڕكی زەمەندا
بەرەوخوار ئەبمەوە
بەم درەنگ وەختەوە چی تۆی هێنا
ئاوا وەك تامێكی شیرین كەوتییە سەر زمانمەوە،
كە من وا خەریكە شەرابم تەواو ئەبێ
بەم درەنگ وەختەوە چی تۆی هێنا
ئاوا نەرم نەرم ئەڕژێیتە كاسەی دڵمەوە
كە من وا خەریكە وەك دوا پشكۆی ناو خۆڵەمێش
لە ڕووناكی ئەكەوم و بۆ ئەبەد ئەكوژێمەوە

## ئاواز ئاواز بۆ لای تۆ دێم

بە تاریکییەکانی ناو دڵم
ڕووناکییەکانی تۆ ئەنووسمەوە
بە خەمبارییەکانی ئەبەدیم
شادییەکانت ئەخوێنمەوە
هەمیشە خۆم لە با لوول ئەدەم
بۆلای تۆ دێم
تۆ سەرەتای کۆتایی منی

## ئاوی من

درەوشانەوەی خامۆشیم
خامۆشی تۆی درەوشاندەوە
داگیرسانی کوژانەوەم
کوژانەوەی تۆی داگیرساندەوە
هاتنم بۆ هاتنی تۆ بوو
مینا تیشك لە تاریکیدا دەرکەوی
خامۆش بوونم بۆ داگیرسانی تۆ بوو
کە وەك پڕووشە لە بیاباغا داڕژێی
ئەی وجوودی هەزار ڕەنگی من
ئەی ئاوی من
ئەی نەبوون و هەبوونی من
ئەی بینایی کوژاوەی من

## نووسینەوەی تۆ

هەموو درەنگەکان کۆ ئەکەمەوە
تا زووەکانی تۆ ڕەنگڕێژکەم
هەموو نەهاتنەکانی تۆ ئەنووسمەوە
تا هاتنەکانی تۆ داڕێژم
هەموو هەراو زەناکانت تۆمار ئەکەم
تا بێدەنگییەکانت ساڕێژکەم

## بەدوای جاویدانی

من بەتاڵم
کەچی سەرم پڕە لە ماناو دەنگی واتا
من پڕم
کەچی چاوم خاڵییە لە وێنە و سامی ڕەنگ
بۆیە دەروونم هەڵئەڕێژم
تا چەند ڕستەیێ
لە مانای ئەبەدییەت داڕێژم

## شای من

بانگت ئەکەم ڕێگاکان وەڵام ئەدەنەوە
تۆ ڕێگاکانت داگیر کردووە
گوێت بۆ رائەدێرم
هیچ دەنگێ نابیسم
تۆ هەموو دەنگەکانت شەڵاڵی خۆت کردووە
تۆ هەموو زەوی و ژێر زەوی و
ئاسمان و سەر ئاسمانی
تۆ ستوونی کەونت ڕاگیر کردووە

## دڵێکی ئاوین

دڵی من شووشەیە
عاشقی درزی قووڵ و ملیارێ شکانە
دڵی من پۆڵایە ئەی بۆ وا زوو شکا؟
دڵی من سێوێکی لەتلەتە
هەر پارچەی لە شوێنێ جێماوە
دڵی من خەمبارە هەر خەمەی لە کۆستێ هێناوە
دڵی من پەیمانەی شەرابە
هەر قەترەی لە رەزێ هێناوە
دڵی من ئاوە بۆ ئاوا ئاگری لێ ئاڵاوە؟

## لە سۆنگەی چی؟

ئەی ماندوو، ئەی خۆم، ئەی تۆ، ئەی هیچ
بە دوای چی ڕائەکەی کە هەرگیز پێناگەی
ئەی خەمگین، ماتەمگێڕی ئەوین
تەمبوورت مەژەنە، کە ژێکانت هەمووی پساوە
ئەی ئەشقیا، ئەی خۆم، ئەی تۆی هیچ
دڵی تۆ لە کام شوێن، لە کام گڕ جێماوە
ئەی خۆم، هیچ و پووچ
خوێنی تۆ لە سۆنگەی کام سەنگین ڕژاوە؟

## ژەنیوەر

ژەنیوەر مانگێکی سامناکە لە شەوی ئەوینت
لەو شەوە من شەختەم لەناو گڕ هێناوە
ئەو شەوە هەرچییەك کە خۆشم ویستووە
لە نەمریم ئاڵاوە، لە ڕۆحم مردووە
ژەنیوەر یادی تاهەتایەی پەتێکە
لە گەردن ئاڵاوە

## دۆڕاندن

ئەی نادیار
دیاربوونت هەنجن بە هەنجنی کردووم
ئەی ڕووناکی
تاریکیت بڕستی چاومی بڕیوە
ئەی بەرزی
نەویاتیت پشتی کووڕ کردمەوە
ئەی قوومارچی
قوومارت تەمەنی لێ بردمەوە

## تەوقی ئەبەدی

کتێبی ئەوینت
پڕیەتی لە شەوقی دابڕان
پڕیەتی لە کۆتی ملی من
لە ڕستەی دابڕان

# چوزانم

ئەمەوێ تۆ لە گەڵما بی، بەڵام حەز ئەکەم تەنیا بم
ئەمەوێ بچمەوە بەرزایی، بەڵام هەر لە سەر زەوی بم
لە گەڵ دڵی خۆما توند بم، بەڵام زۆریش نەرم و نیان بم
بەرەو باشور ڕابکەم، بەڵام هەر لە باکوور بم
هەمیشە لە فڕیندا بم، بەڵام هەر لەسەر پێی خۆم بم
دڵم بە گریان بدەمەوە، بەڵام هەمیشە پێبکەنم
ئەچم ئەگەر مەودای نیوان کەم بێتەوە، بەڵام ناچم
ئەمەوێ لە تۆ نزیك بم، بەڵام ئەمەوێ هەر دوور بم
ئەمەوێ بەرز ببمەوە، تا لە هەموو شوینێ تۆ ببینم
بەڵام هەمیشە لە نزمایيەکاندا ڕووبەڕووم ببیەوە
حەز ئەکەم تۆ هەمیشە، وەك بەفر سپی بچییەوە
بەڵام من حەزم ناکەم بەفر بیت
حەز ئەکەم درەختێکی کەسك بی، من نەمامێکی ساوابم
چوزانم من ئەمەوێ ئاوابم، بەڵام نامەوێ ئاوابم

## خۆرگیران

ئەبێ چەند ساڵ لە تاریکیدا بژیم
تا گورزێ ڕووناکیم بەرکەوێ
ئەبێ چەند ساڵ لە ئاودا بژیم
تا دڵۆپێ شەهدو زوڵاڵم بەرکەوێ
ئەبێ چەند ساڵ لە دارستان بژیم
تا سێبەرێکم بەرکەوێ
ئەبێ چەند ساڵ لە بیابان بژیم
تا ئەگەر لە تەونی سەرابیش بیت
یەکجار وێنەی تۆ دەرکەوێ

## ژەهری مانەوە

که با دێ ئەوەستم  بەڵکو ئێ، دەنگی تۆم بۆ بێنێ
دەنگی تۆ تەنها با ئەتوانێ بیهێنێ
باران دێ دەوەستم بەڵکو ئێ، ڕەنگی تۆم بۆ بێنێ
هەر تەنها بارانە ئەتوانێ ڕەنگی تۆ بنەخشێنێ
زێ هەڵکا ئەوەستم بەڵکو ئێ، سیمای تۆم بۆ بێنێ
زێ نەبێ چی هەیە
لە ئامێزت بکا و سیمات نەپڕوکێنێ
لافاو بێ ئەوەستم بە ڵکو ئێ هەواڵی تۆم بۆ بێنێ
دەنگی تۆ نامەیە تەنها لافاو خێرا ئەیگەیەنێ

## کاسەیێ ڕووناهی

لەڕابردوو ئەترازێم و ئایندە ئەکەم بە ئەنوا
دەستی زەمەن ئەگرم و پێی ئەڵێم
فەرهەنگی تاریکی خۆتم پێ ببەخشە
کە هەزاران هەزار ساڵە ئەینووسییەوە و تەواو نابێ
ئەچمەوە لای کوانووی خۆر داوای لێئەکەم
کاسەیێ ڕووناکیم بۆ هەڵڕێژە بیخۆمەوە
کە هەزاران هەزار ساڵە ئەینۆشیت و تەواو نابێ

## مانا ترازان

سوورِی زەوی بە جێدێڵم
ئەچمە مەداری توانەوە
لە ناو زیوی ئەو دەنگانەی
گوێچکەی مرۆڤ پەی پێ نابەن
دوا لە مەحاڵ ئەکەم
چەیکێ ئەبەدیم بۆ شانە بکات
نارِەحەتی ڕۆحمی تیادا بخەوێنم
بینایی لە دەست چووی چاوم بداتەوە
ئەچمەوە سەر حیکمەتی شیعرێ
سنووری هەموو زمانەکان بڕەتێنێ
گەوهەرێ بنووسمەوە جاویدانی داگیرسێنێ
لە مانا ئەچمە دەرەوە
بێمانایی ئەم گەردوونە بسەلمێنێ

## مەحاڵ

هەست ئەکەم تۆ بچووکترین مەخلووقاتی
بۆیە هەمیشە نادیاری
هەست ئەکەم تۆ گەورەترین مەخلووقاتی
بۆیە هەمیشە دیاری
بچووك بی یاخود گەورەبی
دیار بی یاخۆ نادیار
ئەوەمنم ئەکوژێمەوەو دائەگیرسێم
ئەی تاقانەترین مەحاڵ

# تاجی خۆشەویستی

هەموو جارێ  لە ترۆپکان فڕێم ئەدا
لە ناو قەفەس دیلم ئەکات
لە هەورازو نشێواندا گەوهەرم وردوخاش ئەکات
بۆ ناو دڵی شەوەزەنگان دەستم ئەگرێ
بۆ ڕووناکی و ماڵی چرا ئەشقیایە ڕێگەم ئەگرێ
بەڵام هەر زوو خۆشەویستیی
چەکی ئەکاو دڵم ڕووناك ئەکاتەوە
قەول و قەراری ڕق و قین بۆ لای مەرگ ئەباتەوە
خۆشەویستی لوتکەی بەرزو دەریای قووڵ و
شاری دوورو هەرچی دوورە، هەمووی نزیك ئەکاتەوە
ئەی دڵەکەم تۆ هەمیشە ئاوازی خۆشەویستیی خۆت
بچرپێنە ناو دەماران
با ڕق و قین بفیشکێنێ لە ناو دڵی بەچکە ماران

## شیعر

كه گەڵاكان لێم تووڕەبوون
چوومە لای باغ ئاشت بووینەوە
كه ئاوەكان جێیان هێشتم
كەنار بوو دڵیان دامەوە
كه شیعر دەرگای لێ داخستم
هەموو لایەك خۆڵەمێشیان نایە مشتم

## ئاوێنه

هەرچەند ئەچمە بەر ئاوێنە و خۆم ئەبینم
ئەگەم بەو ڕاستییەی کەوا
من لە سەلالەی برینم
لە هەزارجێ لەت کراوم
لە سێدارەی جیوەی دڵی ئەم ئاوێنەیە دراوم
ئەوە تۆی  ئاوا بۆ ئەبەد بەندت کردووم

## له قووڵایی چاڵەوە

هەمیشە بانگ و هاوارێك
ڕۆحی بوونەوەرەکانییان ئەسمی
شەوقی کەونیان ئەسڕییەوە
هاوارێك هەمیشە
درەختی دڵنیایی لە بێخەوە ئەبڕیەوە
ئەوە هاواری ئینسان بوو

## کلیلی ون

ئەو ڕێگایانە چەند لە کەوانەی قفڵ ئەچن
کلیلەکانیان لە ناو دڵی ماسیدان
ئەو ڕێگایانە چەند لە کەڵبەی شێر ئەچن
شێری ئاسن
لە دەمێکا چارەنووسی مرۆڤەکان هەڵئەپاچن

## چاو

گەڕامەوە ئەو شوێنەی
بۆ یەکەمین جار لەنگەرمان تیا گرتبوو
کەشتییەکەم پڕی بوو لە چاوی ئەو مەلەوانانەی
حووتەکان هەڵیان دابوون
لەوێ گریام زۆر گریام
ڕێگاکان دوکەڵیان لێهەڵئەسا

**دوا ژوور**

ئەچم بۆ ترۆپکی چیاکان

بۆ شارە دوورەکان

بۆ ژێر دەریاو قووڵایی دەریاکان

بۆلای دڵی شکاوی نیشتیمان

بۆ لای کاژی ناو دارستان، مەیخانەکان

دواجاریش ناچار ئەگەڕێمەوە ژوورەکەم

کە وردە وردە بچووك ئەبێتەوە

تا ئەبێتە شەوقێ لە گۆڕستان

## دید

هەمووما‌ن تەماشای یەکتر ئەکەین
تەمەشای ڕووخسارو ئەدگار
بۆینباغ و چاوێلکە و باغ
تەمەشای سەما و ڕۆیشتن بەسەر خاکا
تەماشای پێڵاو و کەمەربەند و زریزە، بریقەی ددان
بەڵام ئاخ کەس تەماشای دڵی کەس ناکا
لەژێر پێی ژیان

## شەوقێکی دوور

هەر لە سپێدەوە
تا هەزاران بەتڵی شەو ڕائەشکێ
هەموو بە تەك یەك ڕائەبوورین
هەمووان یەکتر جێ ئەهێڵین
لە سەردەمی هەستی ئاسن، ڕق و ڤیان
یەکە یەکە و کۆمەڵ کۆمەڵ
لە ماڵ لە شەقام لە بارەکان
لە دەشتایی و نێو ئاوەکان
ئەوە هەمووی
سەرمەشقی ڕاکردنە لە دەست ژیان

## ئێمە کێین

هەمووومان بەسەر تەلی بازنەکەوە
ڕێگەی دوورو درێژمان ئەبڕین
بەڵام هەمیشە ئەگەینەوە هەمان شوێن
ئەسووڕێنەوە و ئەسووڕێینەوە
بە هەمان هەناسەو هەمان خوێن
ئەسووڕێینەوە و ئەسووڕێینەوە و ئەسووڕێینەوە
بەڵام هەرگیز نازانین چین، نازانین کێین

## ئازاری هەرهەری

نازانم لە ژێر زەویم یا لە ئاسمان
سەرئاو کەوتووم یا وام لە بنی دەریاوە
خەونە یاخود ئاگاهی، نازانم ؟
نەزانینم هۆن هۆن ئەمخوا و
بە تاشەی زەمەنم دائەدا
نەزانینم وەك زۆرداریێ مەچەکی ڕۆحم بائەدا

## شای هەمووان

هەمووومان جل لەبەر ئەکەین
ڕەنگەکان لەبەر ئەکەین
شیعرو ستران لەبەر ئەکەین
شەپقەی دانتیل لەسەر ئەکەین
پێلاو لە پێ ئەکەین
کراسی ماهووت لەبەر ئەکەین
دواجاریش شای جلکەکان دێت
ڕووت و قووتمان ئەکاتەوە
هەمووومان لەبەر ئەکات

## ئێستاش دەنگی شوشەی شکاوی سەرخۆشەکان

لە گوێما ئەزرینگێتەوە
بە دەنگی بەرز هاواریان ئەکرد
ئەو دڵانە لە کوێ پڕ لە کوێ هێوری کەین
ئەو ئاسکانە لە کوێی ڕۆحمان حەشار بدەین
ئەو هەمووشەرابە چۆن بچڕین
کە لە سپێدەوە تا شەفەقی سەختی نیوەشەوان
هزری پڕکردووین لە خەون؟
خەریکە سینە شەق ئەکەن
ڕووناکی ئەبەخشن بە کەون

## هودهود

ئەوەی لای تۆم جێهێشتبوو
دەسماڵێکی خوێناوی و سێ چوار پەلکە لیمۆ و
چەند لاسکە ڕێحانێکی مەلەکشا بوو
کە لە ئێوارەییێکی درەنگی باراناوی
بەسەرباڵی مەل ناردبووی
بارانیشی ڕاسپاردبوو
بە فێنکی هەورێکی پاییزی دایانپۆشێ

## ڕۆحێکی شکاو

ئێستاش بەو بۆن و بەرامەوە تا ئێرە هاتووم
ئەوەی لای تۆم نەخشاندووە
گەڵای زەردی ڕۆحمە
کە پاییزێ ئاسکێ دایە دەست خاك وخۆڵت
ئێستاش هەموو سارە شەوانێ پەلك پەلك
ئەکەوێتە کۆشی بنارە دوورەکان
ئەپڕژێتە دڵی زەمان
قسەکردن لە گەڵ خۆر

## هێندی تر ئاوابە ئەی خۆر

مەلەکشا بەسەر قەیسەری قەڵاوە
چاوەڕوانی یەمامە ئەکات
سوارەکانی بایەزید لەدوورەوە ببینێ
نوقلانەی هاتنیان بدات
دەستە دەستە مەیفرۆشەکانی شار
مۆمی عەنبەری زلیان هەڵگرتووە
سنی زێریان بەدواوەیە
کە پڕیەتی لە هەڵمی شەکرو نەبات
بەرەو لای ئاوباری یادەوەریم بەڕێکەوتوون

## مەلەكشا

هەزاران جار لەو ئاوبارانەوە

بەسەر درەختی كاژەوە

بانگی  مەلەكشام كردوە

سەناریا سەناریا ئەی گوڵە جوانەكەم چەند دووری

دەنگم بوو بە ئاو ڕژاویە كەنارەكانەوە

هەزاران جار لەباوەشی سەناریادا

سەیری مانگم كردووە

سەناریا سەناریا ئەی ئەی پەلكە گیا

تیشكی چاوم بۆتە باران

بەسەر جەستەما باریوە

سەناریا  سەناریا ئێستە لەكوێی

ئەندێشەم وا ئەكوژێتەوە ؟

## کۆتی ئاگر

ئەوەندە سینەی خۆت مەکوشە
ئەترسم دڵت بتوێتەوە
ئەوەندە هەناسە هەڵمەکێشە
ئەترسم بۆ ئەبەد بکوژێیتەوە
ئێستاش وەك کەسێکی شێت
چوزانم وەك کتێبێکی پەرپوت
وەك نارنجێکی لەبەر هەتاو سووتاوی بەر پێت
ناخم پڕە لەبیرەوەرییەکانی تۆ

## پەتلیس

ئەمەوێ بگەڕێمەوە  بازاڕەکانی پەتلیس
کەتازە چۆڵ بووە لە کچانی شیر
لەێوە وەك غەریبێ نەکەسی دیبێ و ناسیبێ
دووبارە بێمەوە لات
بێمەوە ناوئەو کوچەو کۆڵانانەی منیان ئەبردەوە
بەهەشت
یەك یەك ئەو پەنا و قەڵا بڵندانە بەسەرکەمەوە کە
شەوان
لە ژێر پەلکی سوندسی زەمەن ئەیانشاردینەوە
ڕێمان دوورەو سپێدە وەك ڕەشەبای تووش
هەڵمانئەگرێ

## شیری زەوی

لەیەك جۆگەلە ڕژاوین
لە فەریكێكا خولْقاوین
بە یەكەوە مەست ئەبووین
كۆمەڵە نەشئەیێكی كورتخایەن بووین
بەسەر ئینجانەی یادەوەرییەكاندا شكاوین
بیرتە لە مانگە شەوێكی سارد ساردا
وەك ئێستای دڵی من سارد
بەسەر لێوارەكاندا شۆر ئەبووینەوە
ئەو گەڵا زەردانەمان ئەژمارد
كە لە ڕۆحمانەوە ئەوەرین
ئەبوو بە ملوانكەی گەردنی زەوی

## نەخشی ئاڵۆز

ئێمە دوو خەمگینترین عاشقین
کەون بەشی ئێمە ناکا
دوو ڕاکردووی بەرەکانی خۆرنشینین
سەرمان هەڵگرتووە بەرەو تۆ ئەی نەیژەنی من
تۆ شەکانەوەیەکی چەند دووری
کە پڕی لە وێنەی من
منی ون لەم کەونەدا
ئێمەی نەخشێکی ئاڵۆز لەم تەونەدا

## دوانه

له با ئاسێ بووینه یا له مه‌له‌كوتی خودا
یا ئه‌وینمان وا گه‌وره‌یه جێی له زه‌وی نابێته‌وه
له بیرت نه‌چێ
دوان له وونبووترین عاشق
به‌ره‌و لای تۆ به‌ڕێكه‌وتوون
دوو ان له بخور
له‌شه‌وق و نوور
دووان له ته‌م له ته‌متومان
دووان له شه‌وبۆی ناو له‌پی شینی ئاسمان

## کتێبی دژواری

من هەمیشە تەوتەمی تۆ دروست ئەکەم
ئەزانم هەستم بەشی تۆ ناکات
بەردەوام وێنەت لە خوێنمدا ئەشۆمەوە
ئەزانم چاوم بەشی تۆ ناکات
تۆ کتێبێکی
بەرلەوەی تەواوی بکەم
تەواوم ئەکات

## بەلەمی زمان

لە نێو بەلەمی زماندا وشە هەیە
قسە لەگەڵ باکان ئەکات
لە نێو دەریای زەماندا
هەندێ ساتی دەگمەن هەیە
یاری بە سەدەکان ئەکات
لە نێو لێکدانەوەی منیش
هەندێ بازی شیعر هەیە
بەرزی ئەبەدی ئەبەخشێ بە قەدەرم

## مەرجانی نەمری

گرێکی چەند تووشی
بەناو پووشی ئێسقانم
گەمەیەکی چەند خۆشی
لە نێو شانۆی سەر زمانم
کە ئەتنووسمەوە ئەوە تۆی وەك مەرجان
هەڵئەڕژێیتە نێو پڕۆسەی سڕینەوە و نەمانم

## بەرزەك

له منەوە وەرین و ڕاکردن تا پای مەرگ
له تۆوە ونبوون له تەمتوومان
خۆشاردنەوە له ناو وەهمی وێنەو زمان
ئەوین بەیەکەوە بوون ئەیکوژێ

## ئاوێزانی

بۆ ئەوەی تۆ بەدیکەم
ئەبێ چاوم وەکو چاوی هەڵۆکان بێ
بۆ ئەوەی هەستت پێبکەم
ئەبێ هەستم وەکو هەستی بێچوەکان بێ
بۆ ئەوەی ساوت بدەم
ئەبێ پەنجەم وەکو قامیش نەوارێژ بێ
بۆ ئەوەی تامیشت بکەم
ئەبێ زمانم بە قەد ڕێی هاتونەهات درێژ بێ

## شەڵاڵبوون

ئاوێکی ڕوون بەدی ئەکەم
ئەوە منم توایمەوە
گڕێکی گەش بەدی ئەکەم
ئەوە منم ئەبمە سووتماك
باییێکی توند وا هەڵئەکا ئەوە منم ئەناڵێنم
وا درەختێ لە بێخەوە دائەڕمێ
ئەوە منم ئەبمەوە خاك

## زیوی زمان

له نێو داروپەردووی زەماندا
زێڕی شکاوی هەندێ وشە ئەدۆزمەوە
زمان پڕ له بریقە ئەکەن
له نێو زێڕو زیوی زماندا
زەمزەمەیی ئەبیستمەوە
زەمان پڕ له شریخە ئەکەن

## شەرابی جاویدانی

دەنگی وشەکان لە دوورەوە دێن
لە گەرووی تۆوە دێن ، لە بن تاشەکان
لە ژێر زەوی و ئاسمانەکان
دەنگی وشەکان
دەنگی وشەکان
شەرابێکی ئەبەدییە دەمپارێزێ
لەسیسبوون وهەڵبزرکان

## شووشه

به نێو دڵە شکاوەکاندا گوزەر ئەکەم
گوێم لە زیڕەی ئاوا ئەبێ
هەناوی زەمەن ئەڕمێنێ
شکانی دڵ و شووشەکان وەك یەك وایە
شەوکەتی زمان ئەشکێنێ

## درۆ

شاعیر بوون درۆیەکی بچووکە
لە چاو گڕکانی نادیاریت
چۆن بتوانم درۆیەك بنووسمەوە
گەورەتر بێت لە ڕاستی

## حەشیشی فڕین

ئەو باڵانەی پێی ئەفڕم و ئەنیشمەوە
شیعر پەڕوپۆی کردوون
شیعر نەبێ شاباڵم ئەشکێ
چیتر پێم لە زەوی نابێتەوە

## بازنە

زۆرم بیرکردەوە شیعر شەڕە لە گەڵ زمان
زمان شەڕە لە گەڵ زەمان
زەمان شەڕە لەگەڵ بازنە
زۆرم بیرکردەوە بازنە ئەبەدییە و کۆتایی نایەت

## خەون

من خەونم نەبینیوە
کائینێکی چەند بێ خەونم
ژیانم تاقە خەونێکە خۆم نایبینم
بۆیە هەمیشە خەون بە خەونەوە ئەبینم
بەڵام هەرگیز من خەون نابینم

## ژیان

ژیان خەونێکی ئاوییە
هەموومان مەلەی تیا ئەکەین تەونێکی ئاگراوییە
هەموومان لە ناویا سووتووین
ژیان بایەکی تیژپەڕە
هەموومان لەگەڵ خۆیا ئەبات

1

کوانووی ئاگرەکەم
پڕە لە هاواری دار کاژەکان
کتێبەکانم پڕن
لە زایەڵەی حەرفە ڕژاوەکان
سەعاتەکەم پڕە
لەناڵەی زەمەنی بەسەرچوو
ڕەوەزەکانم پڕن
لە زیڕەی ئاسکە کوژراوەکان

*

بەسەرهاتی ئەو دامێنەم دەخوێندەوە
لوتکە بەسەریا دەناڵێ
کە کتێبی پڕ لە گیای لوتکەم بینی
ئاسکێ خوێنی لێ دەچۆڕایەوە

2

بانگت دەکەم

چیا لە ژێر ناوت ئاگر دەگرێ

بانگت دەکەم

پشکۆ لە زمانم هەڵدەسێ

شەوەزەنگ لە پەل وپۆ دەکەوێ

کاتێ کەوا بانگت دەکەم

چراکان دادەگیرسێن و با دەخەوێ

*

بۆ یەکجار لە پشت شووشەی هەورا

وەك باران دارژای

بۆ ئەبەد کێڵگەی من پڕ بوو لە شەوبۆی سوور

3

هەموومان ڕادەکەین و ڕادەکەین و ڕادەکەین
هەندێ لە ناو بادا
مرواری ژیان دەدۆزێتەوە
هەندێ لە ناو تاریکەشەوی هاواردا
ئاڵتوونی وەڵام دەبینێ
هەندێ بە ناو گریاندا خەندە دەچنێتەوە
لە باوەشی ژیان دەخەوێ
هەمووەمان بەندەی ڕاکردن و هاوارین
نە دەگەین نە وەڵاممان دەست دەکەوێ

*

هەموو بۆ ژیان ڕادەکەین
کە دەیگرین ورد ورد کورتی دەکەینەوە
کراسێکی سپی لەبەر دەکەین
هەموو بۆ مەرگ ڕادەکەین

4

تۆ سیحرێکی چەند بە سامی
دەمکەی بە ئاو
دەمکەی بە تۆپێکی بچووك و ڕامدەدەی
تۆ سیحرێکی پڕ هەیبەتی
دەمکەی بە باوەشێ گەڵا
گڕوگڵپەم تێبەردەدەی
دەمکەی بە بەرد توورم دەدەی
تۆ سیحرێکی شەرابیت و
لە پەیمانەی پڕی خۆتا
وەك باوەشێ فەریکی کاڵ
دەمپێچییەوەو بۆ تا هەتا لوولم دەدەی

*

شیعری گەورە خەونی بچووك دەگێڕێتەوە
شیعری بچووك خەونی گەورە دەنووسێتەوە

5

درەختی یادی تۆ چەند دوورە
چەند دوورە درەختی یادی تۆ
رۆژەکان چەند زوو دێن و رادەبرن
هاتنی تۆش چەند درەنگ

*

هێندێ وشە وەها لە گیانم بەردەبن
کە سپێدان سەیری جەستەم دەکەم
کون کون بووە

## 6

دەتنووسمەوە لە نێو پەنجەم دەتوێیتەوە

دەتخوێنمەوە لە پەڕی زمانم دەئاڵێی

دەتخۆمەوە لە سینەما دەبی بە بەرد

دەتهۆنمەوە لە گەردنم دەبی بە کۆت

کاتێکیش کە ڕەهات دەکەم

لە ناو ڕۆحم دادەگیرسێی

*

ئەو شیعرانەی لە دەفتەری دڵم

ڕەشم کردنەوە

شەوانە گەردنم دەگرن

7

که هاتی ڕووناکی بوو بە تاڤگەی ڕەنگ
ڕژایە دەشت و شارەکان
دونیا پڕ بوو لە تریفەی جاویدانی
وەکو شەراب ڕژاینە ناو
کونجی مەیخانە و باڕەکان

*

گەوهەری دڵی من ئەوەندە شکاوە
بە ڕستەی شیعر جەبرم کردووە
هەر وشەیێ لەو پەیکەرە دەرکێشم
هەڵدەوەرێ

8

ڕۆیشتنم جۆگەلەیە

تیکەڵی ناو دەریا دەبێت

دووکەڵێکەو بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێت

دیوتانە جۆگەڵەو جۆبار

جارێك بۆ دواوە بێنەوە

من پیشەمە

هەر بڕۆم و هەر بڕۆم هەر بڕۆم

ئاوڕ لە دوا نەدەمەوە

*

کە شووشەی خەیاڵم

وەك شیلە هەڵڕژا

دونیا پڕ بوو لە هەنگ

9

پێویستیم بە ئاگر هەیە تا نەسووتێم
پێویستیم بە لافاو هەیە تا نەخنکێم
ئاماژەکانی ئەوینت
لە دڵما جێی نابێتەوە
کتێبت لێوانلێو کردووم
وشەکانت تژی مانای قووڵ کردووە
زمانت لێ داگیر کردووم
منت لە نێو دەریای مەجاز لاڵ کردووە

*

کە سەری خۆم
وەك دەنکە ترێیەك کوشی
تك تك شەراب لە زمانم دەچۆڕایەوە

10

ژوورەکەم پڕبووە لە تەوقی وەڕەسی
پڕبووە لە زمانی شکاو
ژوورەکەم پڕ بووە لە سیفری ڕەهایی
پڕ بووە لە کەشتی ڕاکردن بۆ ناو ئاو
دەمەوێ ڕابکەم ڕابکەم هەمیشە ڕابکەم
ئاخر من باڵندەم
بۆ قاچم لە زەوی گیر بووە؟

*

ڕمی شیعرێ رێگەی شەق کرد
کەوتمە ناو باخی جاویدانی
تەنها شەرابی مانا
شیعر لە شکان دەپارێزێ

11

دەسوورێمەوەو دەسوورێمەوە
بە دوای دیتنەوەی شووشەی شکاوی
مەرجانی ئەوین
ئەگەرچی دیارە سووڕانەوەی من
تەنها کەوتنی
زمانی شیعرو جەستەمی تیایە
بەڵام هەمدیسان
دەسوورێمەوەو دەسوورێمەوە

*

هێندەم کتێب بە دوای چاوی تۆ خوێندەوە
ئێستا چاوێکم شووشەیەو چاوێکیشم ڕژا
تەنها بە بۆنی کتێبەکانەوەیە دەتبینم

12

هەتا چاوم هەتەر دەکات

من هەر بۆ لای تۆ دەڕوانم

تۆ هەبوونی

تۆ هەم کەونی هەم کائینات

هەرچی کات و شوێنیش هەیە

لە تۆدا خەست بوونەتەوە

بۆیە تەمایەك شك نابەم بۆ مانەوەم

من لە دەرەوەی زەمانم

*

لە مەداری پووچی سەرەتانی شەڕی بێ ئەمان

شیعر جوانی لە تاق دەنێ

وشە دەبێتە مەتەرێزو

قەڵەم قەڵغان

13

چەند دژوارە

بانگی من و بەستەی هەزاران دەنگی تۆ

دووری من و جەستەی هەزاران ڕەنگی تۆ

تاریکی تەنهایی من و

چرای هەزاران شەوقی تۆ

ئاگری سووتانی من و

تاڤگەی هەزاران خوڕڕەی تۆ

ئەی چەتری سەری خەمگینم

ئاخر تاکەی بە تەمای تۆ؟

*

گیا تاقانە کچی زەوییە

پەلەی سیس بوونیەتی

تا بچێتەوە باوەشی دایکییەوە

## 14

له نێو هەراوزەنادا
بێدەنگی خۆم دەناسمەوە
له نێو دڵی تاریکیدا
ڕووناهی ناو دڵی خۆم دەبینم
به سەر لێواری دەریادا
قووڵایی خۆم دەدۆزمەوە
له ناو پەیمانەی شەرابدا
ئاگاهی خۆم دادەڕێژم

*

که له سەمای شیعر بوومەوە
تەزوێك گیانی داگرتم
هەر لەو ساتەوەی دوا دێرم
له جامی سپی زەینم گرت
خۆشییەکانی ژیانم مرد

## 15

درودێك لە دڵما لە ئاوی شیعردا ڕژاوە

تاجیلەی ترۆپکی لە سەری تۆ ناوە

بۆتە تەیمانی گوڵ بە دەوری ئەدگارتا

هەر بۆیەش کە هەنگاو هەڵدێنی

وەك دڵی ناو سینەم

چی دەماری خوێنە

لە جەستەی ماندووما  دەجمێنی

*

وا هەست دەکەم

دەنگ فڕینی هاواری ئەو مەلانەیە

لەقەفەزی سینە بەند کراون

16

هاوارێ ئەبیستم

زریکەی ئاسکی ئازادە

لە بەر ماشەی دیلیی ڕاوچیدا

هاوارێ ئەبیستم

کوژرانی فڕینە

لە ناو ورشەی دووری سووتانی پەڕوباڵ

هاوارێ ئەبیستم

شکانی یەقینی هاتنتە

لە نێو باغی مەحاڵ

*

هەموو لاپەڕەکانی ژیانمان ڕەش کردەوە

لاپەڕێ ژینی سپی نەکردینەوە

## 17

که دەست لە ناو دەستم دەنێی
ئاواز ئاواز دەتوێمەوەو دەبم بە ئاو
کە دەترازێی تاوێری ژێر پێم دەتەقێ
هەرچی مسی ڕۆحم هەیە دەتوێتەوە
بەسەر کەمانچەی ئازارما
دەبێ بە ژێ

*

گیا ورد ورد
خۆی ڕووتکردەوە و سیس هەڵگەڕا
سەوزایی خۆی بەخشی بە زەوی

18

دەنگی تۆ وەك

خوڕڕەی ئاو و شنەی بایێ

دەنگی تۆ وەك

دڵۆپەی شەونم و پەلکە گیایێ

دەنگی تۆ

وەك باخی ئەوین و لوتکە چیایێ

دەنگی تۆ تان و پۆی بوونە

وەك بەندۆلی ئەبەدییە

لە پێڤاژۆی هاتوو چوونا

*

ژیانم بینی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە

ڕۆژو مانگ و ساڵەکانی خۆی کۆ دەکردەوە

خوێنی لێ دەچۆڕایەوە

19

هەر دەڵێی تارمایی

بازێکی تۆراوی لە ئاسمان

یا دەنگی ئاوێکی ڕژاوی

لە ژێر تاشەو تاوێران

تۆ ڕەنگێکی جیای ناو تەونی ئاماژەی

کەی دەنیشیتەوە تا پەڕوباڵ بگرم

کەی دوا دێڕی فڕین دەبەخشی بە ترۆپك

تا لە ناو ئاماژەی نیشتنەوەی تۆ بمرم

*

لە هەورازو ڕك و ڕەوەزان

لە لێمشتی تووڕەی گەردوون

ناوی تۆم نووسیوە

20

تۆ تاتۆی تاووسی

بەسەر پەڕەی بازوومدا

تۆ داغی ئەوینی

بەسەر تەختی هەنیەم

تۆ هاوارێکی دووری

وەکو ئاو بە هەموو لایەکا هەڵدەڕژێی

تۆ پڕووشەی ئەبەدییەتی

بەسەر دەست و پەنجەی شیعردا دەپژێی

*

خۆر هەڵدێ تۆ ئاوا دەبیت

تۆ ئاوا دەبیت خۆر هەڵدێ

21

لەوەتەی ئەوینت منی داگرتووە
چی حەرف و ڕستەیە لەسەر فەرشی شیعرو
لە نووکی قەڵەمدا مردووە
نە مەستی بەشی هزرم دەکا
نە مەرگیش سۆراغی من دەکا

*

گوێم لە کزەی سینەیەکە
ترس لە شەو بەردەدا
ئەوە دڵە دەسووتێ
یا جریوەی مەستی مەلێکە؟

22

چەند لە تۆدا مەستم

هەر دەڵێی شەرابی زەوینم نۆشیوە

چەند بێ تۆ بێ هەستم

هەر دەڵێی کراسی ئەبەدی

پرسەی خۆم پۆشیوە

*

گلاسێ ئاگری فیراقم خواردەوە

بووم بە خۆڵەمێش

بۆ ساتێ  بە دیارتا وەستام

بۆ ئەبەد کەوتم

23

تەوقێکی نادیاری ئەوینی

بەسەر گەردنمەوە

بەو تەوقە من دیلی ئەبەدیم

شەوقێکی دیاری جودایی

بە ناو دڵمەوە

بەو شەوقە وەك سەدا سەرمەدیم

لە میانی ئەوینی ئەم تەوقە و شەوقی تۆ

وەرینی ئەبەدییە لە باڵ و پەڕوپۆ

*

گۆڕەکانم هەڵکەندو ئەستێرەکانم ناشتن

چەند رستەیێ لە ناو بەردەڵانەکە

لەدایك بوون

ناوم نان کۆمیدیای ژیان

24

دەزانم بایەکان لەلای تۆوەیە دێن
ئارمووشی ئەوینن لە گەردن دەئاڵێن
من بە جووڵەی تۆوە بایەکان دەناسم
ئەو بایەی
کە لە لای تۆوەڕا هەڵدەکا
بایەکی ئەزەلی زۆر نەرمە
وەك تیغی ئەڵماسی ساودراو بە ئەوین
ماهووتی سەردڵم شەق دەکا

*

تەنها شەرابی شیعر
هێزی مانەوەم پێدەبەخشێ

25

کەی بە دادم دەگەی؟

وەك گیا

لە لێواری کەونا

بۆ تۆ شین ببمەوە

کەی بە دیار دەکەوی؟ دووبارە

لە تاو شەوقی چاووت من ئاوا ببمەوە ؟

*

شەرابی مانا

پێویستی بە کوشینی

ترێی ناو سەری شاعیرە

## 26

هەمیشە شتێ هەیە
جار جار دەروونم ساودەدا
هەمیشە سیمایێ شەرابی عومرم دەڕێژێ
لەم هەورە دابەزە وەرە لام
تا لە زەوی جێگەم بێتەوە
هەمیشە شتێ هەیە
دەست و مەچەکم بادەدا

*

وانەی ئاگرم خوێندەوە
شارەزای خۆڵەمێش بووم
وانەی خۆڵەمێشم خوێندەوە
شارەزای ئاگر بووم

27

زۆرجار ئەلفم هێندە درێژ کردۆتەوە
تا بگا بە دڵی تابان
زۆرجار شینم هێندە بە خوێنی تۆخ کردووە
تا بگا بە شینی ئاسمان
بەڵام هەمیشە مەست بوویمە
لە ناو شینی گەرمی ژیان

*

ئاو جیاوازە لە لافاو
لافاو کارەساتی هەور دەگێڕێتەوە

## 28

له شەرابی سپی ئەزەلدا
وێنەی تۆم بینیوە
وەك شەستە بە سەرما ڕژاوە
له شەپۆلی ڕەشی زەمەندا
سپی تۆم بینیوە
وەکو شیربە سەرما باریوە
لە ناو تای مەرگ و میر
گۆرانیم بۆ جاویدانی تۆ چڕیوە

*

ئەو شیعرانەی ناتوانن
قومێ ئاو بۆ ئاسکەکان ڕاگرن
میوانداری جوانییان پێ ناکرێ

29

هەمیشە ئاڵۆزییەك

هەیە سەر لە ڕۆحم دەشێوێنێ

نازانم لە ناخمایە

یا من لە ناخی ئەو ئاڵۆزیەم

ئەوەندە دەزانم ئاڵۆزییەك هەیە

لە دەستم دەئاڵێ

ئەی ئاڵۆزی

ئالۆزییەکانی رۆحی سەر بەتەم

کەی پەی بە نهێنییەکانی ئێوە دەبەم؟

*

دڵم وەك سێوێکی کون کون بۆتە نەیژەن

ئاوازی حەسرەت هەڵدەڕێژێ

## 30

دوور لە شووشە مل باریکەکانی شەراب
نزیك لە هیتەرە داگیرساوەکە
کە وەك دوو ماری سوور
بە دەوریا دەسووڕێتەوە
بەرامبەر چەند تابلۆیەکی سووریالی
بیر لە وایەرە
سپی و سادەکەی وزە دەکاتەوە
تا بە هەموو
دونیای ئاڵۆزی ببەستێتەوە

*

کە جامی سەعاتەکەم درزی برد
زەمەن ڕژا و ژوورەکەم ڕەش داگەڕا
ڕەنگی زەمەن ڕەشە

## 31

دەنگێ نابیستم
دەزانم بێدەنگیت دونیای گرتووە
ڕەنگێ نابینم دەزانم ڕەنگینیت
کەونی بە هەر هەموو فەلەکەوە ڕاگرتووە
تیشکێ هەڵنایێ دەزانم تیشکێنیت
خۆری لە ژێر باڵی خۆیا داپۆشتووە
هیچ شیعرێکم بۆ نانووسرێت و دەزانم
سیمات هەموو جووڵەیەکی
قەڵەمی داگیر کردووە

*

وەك مۆمێکی بچووك
تۆم لە ناو وشەکان داگیرساند
ژیانم گڕی گرت
ئێستاش بە هەزاران هەزار ڕستە
بۆم ناکوژێتەوە

32

من بە دوای جوانیی مانات دەگەڕێم
مانا جوانەکان هەموویان
وەك گڕ لە ناو دڵی تۆ
وەك ئەزەل دادەگیرسێن و بەرز دەبنەوە
لە دەرەوەی تۆدا مانا نامینێ
بۆیە ناچارم هەتا هەتایە
لە داگیرسانتا من بتوێمەوە

*

ئاسکەکان جگە لە ڕاکردن هیچیان نییە،
کە لە ڕاکردن دەکەون
گەردنی خۆیان بە قەدەر دەبەخشن

## 33

تۆ نزیکتێکی لە دوورەکان و ڕەشێکی لە نێو سپییەکان

تۆ نەوییێکی لە بەرزەکان و وەهمێکی لە نێو ڕاستییەکان

شەوێکی لە ڕۆژەکان و رۆژێکی لە نێو شەوەکان

تۆ باوەشێکی گەرمی

لە نێو ڕۆژگارە زوقم و ساردەکان

دۆستێکی چەند میهرەبانی لە نێو دژە دڵرەقەکان

دەمەوێ لە ناو لەپم بیت

تا هەمیشە بۆنت بکەم

لە ناو چاوم بیت تا هەست بە بینینم بکەم

لە ناو دڵم بیت

تا هەست بە هی خۆمیت بکەم

*

هەموو ئەوانەی بانگ و هاواریانە

پێویستیان بە ئەوانی ترە

## 34

پۆڵاش بم
له ناو دەنگی پڕ میهری ئەویندا تواپمەوه
شریخەی شێلاقەی چیاش بم
له نێو دەنگی پڕ بازی شیعردا ڕواپمەوه
چلچرای خۆریش بم
من له ناو کوانووی ڕووناکی
ئەدگارت تواپمەوه

*

هەموو شتەکان بۆنی تۆم بۆ دێنن
بەڵام ئاخ تخوبی ڕۆح دەبەزێنن
دوور دوور تا خوێنم

35

مانەوەم لە ناو قوفڵی شیعردا

گەڕانە بە دوای کلیلی کرانەوەی باخۆسی

ژیانەوەم لە ناو ئاگری قەڵەمدا

ونبوونە بە دوای نووسینی

ئاوی سپی ئازادی

گریانم بە دەوری گومەزی سینەتا

خنکانە لە دەریای ئەوینی

تاهەتا مەست و جاویدانی

*

ئەوەی شیلەی ژیانی بڕژێتە ناو تاریکی

تەنها هەر ئەو دەزانێ

کەی دەگاتە ڕووناکی

36

من پێویستم بە تۆ هەیە تا داگیرسێم

تا داگیرسێم من پێویستم بە تۆهەیە

پێویستی من بە تۆ

تاریکی ناو درەوشانەوەیە

درەوشانەوەی تۆ

پەیمانەی من بەتاڵ دەکات

بۆیە زوو زوو دەکوژێمەوە

بەڵام هەمدیس

لە خۆڵەمێشما دەدرەوشێیتەوە

چۆن درەوشانەوەی ڕژاوت کۆکەمەوە؟

کە تۆ هەمیشە پەیمانەم

پڕ داگیرسان دەکەیتەوە

*

ئاسک نییە نەزانێ ،راوچی بۆ دوای کەوتووە

شابالّێ نییە نەزانێ ،باهۆز چی لە دلّدایە

37

له دیمەنێکدا تەوتەمی
که درووودت بۆ دەنێرم
وەك پووشی زیو دادەگیرسێم
له دیمەنێکدا ئاوێکی سپی سپی
که بۆ داگیرسانت دێم دەکوژێیتەوە
تۆ وەك درەختێ ڕەشەبا
لێی ئاڵا بێ هەدادانت نییە
تا بۆ ساتێ بتوانم
تەماشات بکەم و نەکوژێمەوە

*

تەواوی سەر زەوین تەی بکەی
هەموو کیشوەرەکان ببڕی
دواجار تیغی ماسینی ژیان هەر دەتبڕی

38

له مێزێکی ئەو دەوروبەرەوە دانیشتووی
وەك پێکێ شەراب هەڵمدەدەی
چەرەزی دڵم دەشکێنی
قووم قووم سەرم دەخۆیتەوە
ئێستا له ناو پەیمانەتا قەیتانێکم
هاکا ئەویشت نا بە لێوتەوە
مێزەکەی من تاك و تەنیا
بێ مەینۆش دەمێنێتەوە

*

کە تۆ هەمیشە بەفر بیت
دەبێ بۆ ئەبەد کتێبی توانەوە بخوێنمەوە

39

بەسەر ئاوەکاندا دەڕۆی

شوێنپێیەکانت بلێسە بۆ دوور دەنێرن

لە تەمتوومان دادەگیرسێی

لە ناو چاوما دەکوژێیتەوە

کاتێ تەوقەم لەگەڵ دەکەی

وەك مۆم بە ناو پەنجەکانما دەتوێیتەوە

*

شەممەیەك خۆی لە هەفتە دزییەوە

فەلەك لە سووڕانەوە کەوت

ئەوە بوو بۆ ئەبەد نەهاتیتەوە

40

که به ڕێگاکاندا گوزەر دەکەی
ڕووناکی وەك با
بە ئاراستەی تۆ هەڵدەکات
من نوقمی ناو تاریکی و تارمایی دەبم
دەرکەوتنت
ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا دروست دەکات

*

چوومەوە ناو درەختە کلۆرەکەی تەمەن
هەموو گەمە شکاوەکانم دۆزییەوە
تەنها ئاڵتوونی مناڵیم نەبێ

41

دەمەوێ ڕابکەم و ڕابکەم هەمیشە ڕابکەم
لە کەوتنا  لە دوا ترۆپکی سەرکەوتنا
لە دارستان و دەریادا لە ژێر تریفەو زریاندا
لە ناو قاقای پێکەنین و لە نێو فرمێسك و گریاندا
دەمەوێ هەمیشە ڕابکەم
لە ڕاکردندا دەبمەوە خۆم
لە ڕاکردندا حەقیقەت دەگرم

*

ڕێگایەکی دوورم بڕی تا گەیشتم بە خۆم
گەڕانەوەم بوو بە مەحاڵ
ئەوەی بۆ ساتێ خۆی بدۆزێتەوە
بۆ ئەبەد ون دەبێ

42

قامیشەڵانێکی سەوزی
دونیات پڕ لە نەی کردووە
جەستەت کوانووی ڕووناکییە
دەڵێی خۆری نیشتیمانی منت
لە سینەی خۆت بەند کردووە

*

سەدان ساڵ شەڕی ژیانم کرد نەکوژرام
بۆ ساتێ کەوتمە ناو جەنگی
شمشێری ئاوینت پەلی دام

43

بۆ ئەوەی نەسووتێم دەچمەوە ناو ئاگر
بۆ ئەوەی نەخنکێم دەچمەوە ناو دەریا
بۆ ئەوەش تەڕ نەبم دەچمەوە ژێر باران
تا نەخشەی بێتۆیی تێکبدەم
هەر دەبێ شکستی ڕەنگەکان چابکەم

*

هەموو کتێبەکانم داگیرساند
چەند دێڕێك بە قەڵەمی ئاونگ
سەربردەی گیایان دەنووسییەوە

## 44

ژیان لە ئاسێترین ڕەوەز بانگم دەکات
منیش لە بای ئەزەلی تۆدا مەست بوویمە
شەلاڵم بە دەنگ و سەداوە
هەم ژیان بەرەو خۆی ڕامدەکێشێ
هەم تۆش بەرەو خۆت ڕامدەکێشی
منیش تاقە دڵێکم
لە ناو لەپی پڕ میهری تۆ بەندکراوە

*

گۆزەی دڵم کەوتە بەر تیری فبراق
شەوبۆی ئەوینم
شەوی پڕ نوور کردووە

45

من باڵەکان
بەرەو بەرزاییەکانی تۆ دەکەمەوە
تۆ فڕینم قۆڵبەست دەکەی
من لە نێو ئاگاهیەکاندا مەلە دەکەم
تۆش هەمیشە مەستم دەکەی

*

دوێنێ ئازادیم بە خاك سپارد و
جاویدانیم بە ساتێکی کورت گۆڕییەوە

## 46

هەموو شتەکان نزیکن دووریی تۆ نەبێ

هەموو شتەکان دوورن نزیکیی تۆ نەبێ

من بە نزیکی تۆ خنکاوم

بە دووریت

لە شیعر و لە تەوقی گەردن داگیرساوم

دووری و نزیکی دوو چەمکن

وەك دەرگای دوو دەری شەون

شەوان دەبن بە مۆتەکە

سپێدان دەبن بە خەون

*

زوو زوو خەمگین دەبین

بەڵام درەنگ دڵخۆش

## 47

که تریفەی پڕ ئەفسانەی تۆ هەڵدەڕژێ
من ئەوەندە گەورە دەبم
لە هیچ شوێنێکەوە جێگەم نابێتەوە
کاتێ دەبیت بە هەڵم و دەڕەوێیتەوە
ئەوەندە بچووك دەبمەوە
لە نێو تۆزی کتێبەکاندا ون دەبم
پەلەی گزنگی بەیانیم
دووبارە لێم دابێتەوە

*

جوانی لە ناو دەریا ون دەبێ
لە بیاباندا ون دەبێ
جوانی تەنها
لە ناو دڵ دا بە دیار دەکەوێ

48

که بە لای پاییزدا رەت دەبیت

گیا لەسەر تاوێرەکاندا شین دەبێ

کۆتەرەکان نوقڵی گەڵا دەبەشنەوە

که بە بیابانی رۆحمدا گوزەر دەکەی

زەوی پڕ لە باران دەبێت

دونیا لە ئاو نوقم دەکەی

*

هەموومان لە ناو یەك تونێلاین

بەڵام تونێل لە ناو هەمووماندایە

## 49

دەبێ دڵمان
بە تیری ڤیان کون کون کەین
پەنجەکانمان لەناو مەجاز داگیرسێنین
بۆوەی قەڵەم زمان بگرێ و
سیمای سپی بچێتەوە
دەبێ  ئیکارۆس بین بفڕین
لەگەڵ لافاودا هەڵبکەین
ئەلفابای جوانی فێر ببین
بۆوەی بگەین
بە جەوهەری بوونی خۆمان
ئەبێ هەمیشە ڕابکەین

*

دونیا چەند سارد بێ
شەوبۆ بۆنی زۆرتر دەڕوا

## 50

به تاتۆی فڕینی ئەبەدی وشەی ئاڵ
جەستەی من دەرزیژەن کراوە
بە مۆری ڕاکردن بۆ ڕستەی نەمریی
دڵی من شیعرڕێژ کراوە
ئاگری ڕەنگەکان هەردوو باڵیان کردووم
پاپۆڕی توانینم
لە دەریای بێ بنی نەمریی تاودەدا
چاوی دەریاوانیش شکاوە
نەتەمێ دیارەو نە نەورەس باڵی خۆی لێکدەدا

*

درەختێکی هەڵپاچراو،
بە حەسرەتێکی ئەبەدی
لەتەك دەمی تیژی تەورەکەوە
تەرم ئاسا ڕاکشاوە

## 51

من وردو خاشبوونێکی بێ هاوتام
حیکایەتە گەورەکانی
مەسخی خۆم باس دەکەم
زەیتێکی سپیم لە تابلۆی جەنگ
باسی مەرگەساتی ژیان دەکەم
لە شیوەنی مەلێکی باڵشکاوەوە هاتووم
غەریبی فڕین دەکەم
وەك تەوتەمێ لە تاشەی چیا
لە پەرستگای وەهمەوە هاتووم
باس لە حەقیقەتی خۆم دەکەم

*

بە ناو کتێبەکاندا بگەڕێ
ئەگەر دەتەوێ ژیان
بە میلیشیای وەڕەسی نەتکوژێ

52

چوومە ناو پەیمانەی سپی فڕێیدام
ناتوانی  وەك شەراب مەزن بی
چوومەوە ناو کانیاوی سپی فڕێیدام
ناتوانی وەکو ئاو مەزن بی
چوومە دۆزەخی ڕەش فڕێیدام
گوناهبار بۆ هاتی؟
چوومەوە ناو بەهەشت فڕێیدام
بێگوناه بۆ هاتی؟

*

بەرزبوونەوە ئاسانە
بەلام دەبێ شارەزای فڕین بیت

53

ئەو شوێنانەی دڵی شیعریان لێ ڕژاوە
ئێستا بوونەتە کێڵگەی زەنگ
ئەو لانانەی
مەلی شیعریان بەسەردا هەڵکورماوە
ئێستا بوونەتە کوانووی دەنگ
ئەو تابلۆیانەی کە شیعر دایڕشتوون
ئێستا بوونەتە باخچەی ڕەنگ

*

لە مناڵ فێربە
ژیانی خۆش چەند سادەیە

54

شەوقێ هەمیشە دێتە ژوورەکەم
ئەچێتە ناو پێخەفەکەم
ئەچێتە ناو کتێبخانەکەم
وەك فریشتە بەسەر شان و ملمەوە دەنیشێ
بە ڕۆحمەوە خۆی هەڵدەواسێ
شەوقێ هەمیشە دێتە ژوورەکەم

*

هەرگیز لە مردن ناگەڕێمەوە
تا ئێستای خۆم
بۆ نەمریی دوا رۆژ بچنمەوە

55

زۆربا

تازه له کانی خه‌ڵوز مه‌ست بوو بوو

باخۆس

له ناو بوتڵی شه‌راب وه‌کو گێلاس

به‌داری زه‌رفامی زه‌مان ده‌ترینگایه‌وه

هاوارم کرد که‌ی ئه‌گه‌ینه پله‌ی نێرڤانا

له‌وه‌ڵامدا وه‌ك ناقووس زرینگایه‌وه

*

بۆ ئه‌وه ده‌نووسم

له ماهییه‌تی تۆ بگه‌م

تۆش بۆ ئه‌وه ده‌مخوێنیته‌وه

له ماهییه‌تی من بگه‌ی

## 56

که نارنجی ڕۆحم
بە ئاگری شەرابی سوور سووتا
سەدەها وشەو ڕستەم هێنا
جریوەم لە قوڕگی مەل فڕاند
قەڵەمم لە کەمەری شێر دەرهێنا
شیعر دانەگیرسا
کە هاتی
حەرفی ناو کتێبی ئەم کەونە هەڵڕژا
شیعر وەك ڕێژنەی با بە ژیان هەڵپژا

*

شیعر شوێنی حەقیقەتی تیا نابێتەوە

57

من لە ڕابردووەکانەوە بۆ تۆ دێم

تۆش لە ئایندەوە

تۆ ئەفسانەی لە بەر چاوم

من حەقیقەت

سەیرکە چ مەجازێ لوولی داوم

*

ئەگەر ڕۆژێ

هەموو دەنگەکانی فەزا کۆکرێنەوە

هەموو درۆکانی مێژوو ئاشکرا دەبێ

## 58

له گەردوون دەچمە دەرەوە
کپی لێرە بەشی هەموو سەرم ناکات
دەریاکان پڕن لە ژەهر
پڕن لە پاپۆڕی خنکاو
زەوی پڕە لە بەسەرچوونی بێ مانای کات
پڕە لە جەستەی مرۆڤی فڕێدراو
لە گەردوون دەچمە دەرەوە
سەفا لێرە بەشی هزر و زەینم ناکات

*

لە دوورەوە سەیری خۆمم کرد
تازە لە ناو ماڵی ساڵ ئەگەڕایەوە
پشتی بوو بوو بە کەوانەو
سەریشی کێڵگەی بەفر

59

من شەوێکم
لە شەوە هەرە درێژو تاریکەکان
من ڕۆژێکم
لە ڕۆژە هەر گەرم و تۆزاوییەکان
من خەونێکم
لە خەونە هەرە تاڵ و سامناکەکان
شیعرێکیشم لەو شیعرانەی بە ڕستەیەك
تەختی هەبوون بلەرزێنێ
شاعیرێکم
لەو شاعیرە خەمگینانەی بە وشەیێ
کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێ

*

ئۆف ئۆف شەو چەند درێژە
ئارام چەند کورت

60

شیعر کارێکی خوداوەندییە
لە قوڕ شیعر خەڵق دەکەم
لەبەرد مانا دادەتاشم
لە ئاو پیتی بۆ دادەڕێژم
تابتوانم بێ مانایی ئەم ژیانە
لە نێو گۆڕی ئەبەدیدا بنێژم

*

لە ڕژانی ئاو سادەتر دەنووسم
لە مناڵ سادەتر قسە دەکەم

**61**

چەند سپی بووی

لە ناو گلێنەی ڕەشی من

چەند شیرین بووی

لە ناو ژاڵەی دڵی توندی من

ئاسمانی زەویم بووی

پەیك بووی لەکەوان ترازای

ئاسکەکان هەموویان بە دوای تۆ ڕایانکرد

*

پێکەوە بۆ فەنا رادەکەین

من بۆ تۆ، تۆش بۆمن

62

من عاشقی میتافۆرم

میتافۆر لە قورگی شێرە

شێریش لە دارستان ونبووە

دارستان لە کەون ترازاوە

منیش لە مەداری فەلەك

گیرم خواردووە

*

تۆ لە هەموو شوێنێ ئامادەی

لە هەمو شوێنێکیش ونی

63

دەزانم بازدانم کۆتایی بە فڕین نایەت
بەڵام هەمیشە من هەر باز دەدەم
بەر لە من زۆر کەس بازی خۆیان دا
باڵی فڕینیان بۆ نەکرایەوە
ئێستاکەش
قاچیان لە بەردەبازی ژیان گیر بووە

*

دەرگایێکی زۆرم شکاند
کۆتێکی زۆرم پچڕاند

## 64

کورت دەبمەوە،درێژ دەبمەوە
پان دەبمەوە،خڕ دەبمەوە
باریك دەبمەوە،ئەستوور دەبمەوە
دەبم بە بازنە ، دەبم بە لاکێش
دەبمە شەش پاڵو، دەبمە سێگۆشە
دەبم بە سێ سووچ، دەبمە چوار گۆشە
ئا ئەوە شیعرە ئیرادەی لە من سەندووە
شێوەی تازەم پێ ئەبەخشێ
دوام دەخات دەمباتە پێش
دەمڕووخێنێ و دروستم ئەکاتەوە

*

سپێدان هەتاوت بۆ رادەخەم
شەوانەیش تریفەی مانگ

65

هاوارم کرد
دەنگم وەك کریستاڵ شکا
نووسیمەوە
ڕستەم وەك گەڵا هەڵوەری
سەیرم کرد
گلێنەم رژا
کە بیرم لە فیراقت کردەوە

*

هەموو دەنگەکان تۆی
ئەی تاقانە دەنگی من
هەموو ڕەنگەکان تۆی
ئەی تاقانە ڕەنگی من

66

گەوهەری زەمەنم کوشی

پەنجەی کاتم قرچاندەوە

زەمەن پڕ بوو لە دڵی شکاو

کاتیش پڕ بوو لە لە هاواری ئینسان

نەفرەتم کرد لە ئاوێنەی تەڵخی کات و

لە سووڕی بێماناى ژیان

*

کات دەماندۆزێتەوەو

دواجاریش شوێت

بۆ ئەبەد دەەمانشارێتەوە

57

هەمیشە هەتوانی
بۆ قاچی شکاوی کەوەکەی ئەگرتەوە
فرمێسك و خوێنی هەڵدەڕشت
بۆ نەتەوە نەخۆشەکەی
تا مرد گریا
ئاسمان
بە فرمێسکی نەخشی ئەو ئاڵ بووە
کەچی نەتەوە تا ئێستا
لە تای نەخۆشی لاڵ بووە

*

من ناوی تۆم
بە قەڵەمی با نووسیووە
هەواڵی تۆم
لە تەتەری کەو پرسیوە

## 68

شمشێرێکی ڕەش هاتە ناو باغی سپی نیشتیمانم
لە منارەکان
وەسفی پیرۆزی ئەو شمشێرەیان دەکرد
لە باڕەکان بەسەر پێکی شەرابەوە زەمیان دەکرد
شمشێری ڕەش تا دەهات زاووزێی دەکرد
ئێستا رەسمی ئەو شمشێرە لەسەر دەرگاکان کراوە
لەسەر پەڕی ناسکی سەری منداڵەکان دراوە
شەوانە دێتە خەونی کچەکان
بەڕۆژ دەچێتە خوێنی کوڕەکان
دڵنیام دوا جاریش سەری نیشتیمان پەل دەدا
کێ ئەم شمشێرە دەشکێنێ و
لە تەختی نێوچەوانمانا دەریدێنێ؟

*

ئەگەر بێت، مێژووتان دەسڕێتەوە

69

هێندە بەرزم کردیەوە
لە هەتەری چاوم نەمای
ئێستاکە چۆن فڕین لە شاباڵم بەردەم
کە تۆ لەناو دڵی گەرمی خۆرەتاوی
ئەگەر نزیکت کەومەوە ئاگر دەگرم
لەوسەرەوە بە خۆڵەمێشی دێمەوە

*

تەوقەم لە گەڵ کیڵگەیەك کرد
کتێبی بارانی دامێ

70

چاوم دا بە ڕووناکی کتێب
دڵم دا بە ئەوینی تۆ
تەمەنم بەخشی بە خەبان
ڕووناکی چاوی لێ سەندم
ئەوینیش دڵی داغ کردم،
خەباتیش ژینی تاڵ کردم

*

هەموو کوژراوەکان
قوربانی دەستی ئەوانەن
کە خۆشیان ویستووە

17

هەموو شتەکان لە ژێرەوە

بەرەو سەر ڕادەکەن

ماناش لە قووڵایی و ناخدایە

هەر بۆیەش ناچارم تا هەتا

بۆ ناو قووڵاییەکان ڕابکەم

ئەی شیعر

*

ماناکان هەمیشە دەبریسکێنەوە

72

تۆ چەند سادەی، چەند ئاڵۆزی

تۆ چەند ئارام و بێ سەبری

تۆ چەند ڕاستی و چەندە هەڵەی

تۆ چەند ماندووی، چەند حەساوەی

چەند نزیکی و چەندە دووری

چەند بە پەلەی

چەند لەسەرخۆ رادەبووری

پارادۆکسی ناو گۆمێکی بە بێ مەلەی

*

جارێکی تر نەهاتنەوە یەر کانی

ئاسکەکان

ئاویان دەخواردەوە

کە کەوتنە بەر ڕێژنەی ڕاوچییان

73

نیوە شەوێ پشکۆیەکم گرتە دەست و
بە قەڵەمێکی سپی نووسیمەوە
ڕستەکانی کۆتاییان نەدەهات
تا گەیشتینە هەتاو
بە خۆڵەمێشی هاتینەوە

*

هێندێ وشە بوومەلەرزەن
کە لە نێو شیعر هەڵدەکەن
کیانی شاعیر وەردەگێڕن

74

دەفتەری ئاگری دڵی خۆم خوێندەوە
پڕ بوو لە خۆڵەمێش
دەفتەری خۆڵەمێشی دڵی تۆم خوێندەوە
پڕ بوو لە ئاگر

*

تەنها لە فیراقدا ئەوین دادەگیرسێ
ئاگر فیراقە هەڵدیچێ

75

به ئاگرم نووسی ڕووناکی هەڵقوڵا

به ئاوم نووسی ژیان ئاگری گرت

به تۆم نووسی

زمان شکۆفەی کرد

*

تۆ سەرچاوەی هەموو دەنگ و ڕەنگەکانی

سەرچاوەی پژانی

76

که تۆ با بیت
ئایینی من تەنها لە بەر با وەستانە
که تۆ گیا بیت
قەدەری من شەڕی لەشکری پاییزە

*

بۆ تۆ لەبەرامبەر زریاندا سەما دەکەم
لەبەرامبەر دەریادا دەوەستمەوە

77

ئاوازێ لە گریان

لە درەختی رۆحم ئاڵاوە

ئاوازی ئەوینە لە شەوقی داڕسان

بەشی من هەمیشە خۆڵەمێشی گڕە

یا سەرلە نوێ داگیرسان

*

تەوتەمی جەستەی تۆ ئایینی منی مژیوە

پەرستن هەر تەنها بۆ تۆ چەمکی هەیە

78

هەستێکی گڕداره دەمگرێ دەزانم دەمکوژێ
ئەوینێك لە سینەم تاو دەدا
ئێسقانم خاش دەکا
لە تۆدا نوقمی تەمی شەفەق بوویمە
تازه کات نەماوه درەنگە مەلی ئاو تێپەڕین
کام بای تووش دەتوانێ
هەڵمداو بە دوورم خاتەوە لە ئەوین

*

بە شاباڵی هەڵۆ
کەرەستەی گریانمان باردەکەین
پەنجەرەی وەرزێکی مەرگبار دەشکێنین

## 97

دەمەوێ دوور بڕۆم دوور
بۆ دوورترین دەریاچەو چۆم
بۆ شوێنێ کەسی لێ نەبێ
تەنها جارێ بگەم بەخۆم
گوێ هەڵخەم بۆ لەرەی خوێنم
کە بەناو دەمارەکانما هەڵدەڕژێ
تۆزێ لە لای دڵی ماندووی خۆم دانیشم
سەربوردەی خۆی بگێڕێتەوە
ئەوسا وەك کرمی ئاوریشم
دەستم بگرێ بۆ قۆزاخەم بنێرتەوە

*

کەی وەکو هەتاو
دێتە ناو بورجی منەوە؟

08

هەندێجار لەو سەری دونیای دەبینم

قوم قوم شەرابی تەنیایی دەخواتەوە

دڵی من

هەندێجاریش لە ژێر سینەمدا

خۆی رووت و قووت کردۆتەوە

بە فوارەی خوێن

جەستەی نەرمی دەشواتەوە

*

بۆ یەکجار لە پشت شووشەی هەورا

وەك باران دارڕژای

بۆ ئەبەد کێڵگەی

من پڕ بوو لە شەوبۆی سوور

## 81

### کەسێ دێ

تۆزی  شکست و ڕەشەبای مەرگی لێنیشتووە
کەسێ دێ باوەشی پڕە لە خەمگینی
دڵی پڕە لە برین و شانی لە ژێر ئازارا دەچریکێنێ
کەسێ دێ یادەوەرییەکانی لە دەست داوە
زاکیرە ی خاپوور بووە و هیچ کەسێ ناناسێتەوە
کەسێ دێ ئێستاو رابردوو و ئایندەی لا نەماوە
ئەو کەسە منم،تۆی،هەموومانین
بێهوودە رادەکەین و دەجەنگین و دەجەنگین
بەڵام  هەمیشە دەبەزین

*

لە دوورەوە سەیری خۆمم کرد
تازە لە ناو ماڵی ساڵ دەگەڕایەوە
پشتی بوو بوو بە کەوانەو سەریشی کێڵگەی شەکر

82

داهاتووم بۆ ڕوون کەرەوە ئەی شیعر
تا ئێستای خۆم کۆکەمەوە
تاریکیم بۆ سپیکەوە ئەی شیعر
تا پەڕی ڕووناکی هەڵدەمەوە
باسی دەریام بۆ بکە ئەی شیعر
تا لە قووڵایی بگەم و
چیتر لە تەنکاییەکانی تۆدا غەرق نەبم
باسی گەرداوم بۆ بکە
تاماڵی خۆم بپێچمەوەو
بەرەو ماڵە گەورەکەی تۆ بەڕێکەوم

*

بە ناو کتێبەکاندا بگەڕێ، گەر دەتەوێ ژیان
بە میلیشیای وەڕەسی نەتکوژێ

## 83

دیسێمبەر

مانگێکی چەند دوورە لەو سەری دونیایە
من تازە بێشەڵانی ساڵم خۆش دەکەم
تازە من نامەم بۆ ئایندە نووسیوە
تازە من وادەم بە دڵ داوە
لە شەرابی سووری کازێوە تیشکی بۆ بهێنم
دیسێمبەر چەند دوورە
بیگەمێ زەمەن بەسەر دەچێ ساڵ دەمرێ
پووشی ئەو سەفەرەم لە گەڵ تۆ با دەیباو
شووشەی پەنجەرانم لێ دەشکێ

*

ئاوی سپی ناو چاوی من
کتێب و شیعرە خەست بووە
ئاوی ڕەشی گلێنەشم
دڵی خۆمە لە تراژیکی ژیاندا
بە شەرابی حوزن مەست بووە

**84**

ئەو کاتەی دێمەوە ئەبینی
بەفر چۆن لە سیمام نیشتووە
ژەهری چ تراژیکی کوشندەم چەشتووە
بەرلەوەی فیراپت
من بکا بە تەریوەی زەمان
شکاندت ئەو دڵەی سەد ساڵە
وێنەی تۆم لە مینای خوێنینی گرتووە
ئەی ئاوونگی شکاوی
سەرپەڕەی کتێبی ئەبەدیم

*

ئێستاکە لە ماڵی تەنهایی
بۆ کتێبێ ئەگەڕێم کتێبی بینایی

85

جریوەی دێ

دەڵێی کوانووی پڕ ئاگری فیغانە

ئەو مەلانەی ئەوین گەرووی داغکردوون

دەکوژێنەوە هەروەك چرای گەوەی دوور

ئەو سکاڵانەی

کە خۆڵەمێش هەناسەی لێبڕیون

توانەوە لە مەینەتی ڕۆژگارا

ئەو ڕۆحانەی ئازادی شێتی کردوون

*

ئێستاش وێنەکەم لە نێو کتێبی دڵت هەرماوە

ئەو کتێبەی ئەوین سووتاندی و بوو بە بلێسە

## 86

به بەهانەی وەرینی ناوی تۆ
بەسەر قەدییانەوە
درەختەکان خۆیان کوشت
میلۆدییەکان کوژانەوە
تۆ پرشنگی یا نەخشی تەونی
ئاوا لەگەڵ ئاوابوونت
زەوین شەق بوو و ئاسمان رووخا
یا ستوونی بە گیا چنراوەکەی کەونی

*

ئەوسا ئاهێکی ساردو مەینەتبار
ئەترِفێنێت و ئەتبا بۆ دواوە

87

له زیوی ئه‌و خوێنه‌ی

وه‌ك شیعربازرقه‌ی ١ه‌دا

كتێبی تریفه‌ی تۆم كرده‌وه

پڕ بوو له ئه‌سپ

به‌ره‌و ترۆپك رایانده‌كرد

پڕ بوو له شمشێری شكاو

ده‌بریسكانه‌وه

تا دوا دڵۆپ

ده‌نگی تریفه‌و فیراقت هه‌ڵده‌ڕژا

نه‌مزانی دوا رسته چی بوو یاوه‌ری من ؟

كه‌چاوم سپی بوو و دونیا تاریك هه‌ڵگه‌ڕا

*

دڵی من چه‌ند تونده

باڵی هاتنی تۆش چه‌ند شله

## 88

شەبەیخوونی
هەموو ڕستە گەورەکانی ناو کتێبان
خاڵێکی بچووك دەیوەستێنێ
سەرەتای هەموو چەمکە قووڵەکان
مەبەستێ دەیتروکێنێ
چاو تەنها پەلکی شتەکان بەدی دەکات
بەڵام ئەوە دڵە جەوهەری ئینسان دەبینێ

*

ئاوازی گریانم چەند گەرمە
لوتفی تۆش چەند ساردە

## 89

له نێو دیلبوونی  زماندا
که برووسکه
پشتی گوزارەی شکاندووم
بورجی ئەوینم دروست کردووه
له نێو تاڵاوی چەرخی زەماندا
که مینا شمشێر دڵی شەق کردووم
شیلەی شیرینی شیعرم ڕشتووه
له نێو ناماناو تەمتوومانی ژین
ئاڵام بۆ مانای قووڵ هەڵکردووه

*

دڵت بردم و باڵت گرت
کەی ئەو دڵەم دەهێنییەوه ؟

## 90

مەلێکی سپی
بە ئاسمانی شار دەسوورێتەوە
سەردانەوێنن ئەوە سیمبۆلی شەهیدەکانە
ئەڵێی ئاقیقە
لە ناو دەریای شین دەدرەوشێتەوە

*

لەژێر تارای کاژی سپی نیشتیماندا
تیرەمارێ ژەهر ئەبەشێتەوە

91

هەرچەند دیوارم

لە پۆڵای کتێب دروست کردووە

باخێ لە زرێی دەستە واژەکان

دەوریان داوم

بەڵام دواجار

تیری کەوانت هەر گەیشتە من

دڵی کون کردم

*

ئەوین بە هەموو ڕێگاکان دەزانێ

هەموو قوفڵەکان دەشکێنێ

ئەڤین بای جاویدانی هەلیدەسووڕێنێ

92

کچێك لە دوورترین شوێنی دونیا
لە سێبەری تاوێرە بەردێ
نزیك درەختێکی ڕووتەڵە
بەجلێکی ڕەش و دڵێکی سپی
بەخەونی گەڕانەوەی عاشق
وەستاوە سەیری دوور ئەکا
بەڵکو یەکێ، ئاخ بۆ یەکێ چەشنی زۆربا
دەستی بگرێ و سواری ئەسپە شێکەی بکا
بۆ تا ئەبەد لە کچێنی ڕزگاری کا

*

وەك ئاو ڕۆشتی و بۆ ئەبەد نەگەڕایتەوە
وەکو شنە هەڵت کردوو جارێکی تر نەهاتییەوە

93

هێندەی نەمابوو
ترێ لە ناو گەڵامێو بڕسکێ
دونیا پڕ لە شەراب ببێ
هێندەی نەمابوو
سپێدە لە ناو ماڵی شەو بێتەوە
ئاسمان پڕ لە ئاواز ببێ
پەیمانەم بۆ پڕ دەکردی
فەلەکم بۆ ڕادەگرتی

*

چوونەوەی تۆ کیانی من وردوخاش دەکا
وەك چۆن کە مانگ ئاوا دەبێت
تریفە دەست بە گریان دەکا

## 94

### ئەوینی تۆ

هەرچی لوتکەی هزری منە داپۆشیوە
تادێ لە نێو خوێنی مندا ئاگر دەگرێ
باش دەزانم لە دواجارا
دەبم بە مشتێ خۆڵەمێش
پەرش و بڵاوی دونیا دەبم

*

تۆ وەك دڵۆپە شەونمی
کە لە گیا دەبریسکێتەوە
تۆ وەکو ریژنەی ئاگری
لە من دادەگیرسێیتەوە

95

دڵی من هەر وەك پۆڵایە
ئەوین لە ناو کوورەی ئاگر
جۆش و خرۆشی پێداوە
بۆتە سێوێکی ئالتوونی لەتەلاری سینەمدا
وەك تیشکێ لە تاو دەبریسکێتەوە
بۆیە ئەوینم تەواوی زەوی
لە ناو ڕەونەقی ئەبەدی خۆیا شاردۆتەوە

*

ئەوە ئەوینە ئەڵماسی شیعر دەخوڵقێنێ
بوومەلەرزە ئاگری ناخی زەوییە

96

هەر وەکو شووشەی بەللوری سپی
شکا ئەو دڵەم
کێ ئەو دڵەی من چاك دەکاتەوە ؟
هەروەکو تاڤگەی تیژپەڕی ڕەوەز
ڕژا ئەو خوێنەم
کێ ئەو خوێنەی من کۆدەکاتەوە ؟
مینا ئەو هەڵمەی ڕووپەڕی دەریا
بیناییم هەڵچوو کێ بینایی خۆم پێدەداتەوە؟
بە دڵی شکاو، بەخوێنی ڕژاو
بە چاوی ڕەشی بینایی نەماو
تازە چۆن ئاگر هەڵبگیرسێنێ و
ڕەشماڵی ڕۆحی لە سێبەری تۆ هەڵبخاتەوە ؟

*

ئەی ڕاگری ئاو و ئاگر، ئەی ئەڤین
بە پاکی ئاو بمگرەوە با نەکەوم
مرۆڤ بکەوێ هەڵناسێتەوە

## 97

باوەشێ بام هەناردە ناو درستانێ
سەبەتە پڕ بوون لە ترێ
گۆزەکان پڕ لە شەرابی سوور بوونەوە
ڕێژنەیێ بارانی سپیم
بەسەر کێڵگەکان بەشییەوە
فەریك لە ناو شیر داگیرسا
پشکۆی زەوی گەشبوونەوە
کە کتێبی مەینەتباری ژیانم خوێندەوە
چی ڕستەی سەر زمانم بوو ڕشبوونەوە

*

ئەو کاتەی دێمەوە ئەبینی بەفر
چۆن لە سیمام نیشتووە
ژەهری چ تراژیکی کوشندەم چەشتووە

98

ناو دڵت ئەبینم
پڕیەتی لە زریکەی شکان
حیکمەتی ناو لەپت دەدوێنم
تژییە لە باخی پڕ هێڵی
شەڵاڵ بە تەمتومانی گومان
کەباڵت بۆ لای من لێکدەدەی
زیوی شین هەڵدەڕژێ
شیعر وەك ڕیتمی گیا هەڵدەپژێ
کیمیای بوون پڕئەبێ لە هاوکێشەی زمان

*

بەر لەوەی فیراپت من بکا بە تەریوەی زەمان
شکاندت ئەو دڵەی سەد ساڵە

## 99

زەرفێ وشەم بۆ هێنابووی
هەر وشێکم لە کتێبێ دەرهێنابوو
قاپێ شەونمی ئاوینم بۆ هەناردی
هەر دلۆپێکیم
لە گەرووی بەیانێکدا هەڵێنابوو
بەڵام تۆ مەلی وەهم و تەمتوومان بووی
لەنێو کتێبی بێباکی و خەیاڵ
نە وشە تۆیان دۆزییەوە
نە شەونم بەسەر ڕوخساری تۆ کەوتەوە
ناچارم ئەی شەرابی سپی
قفلی سەری تۆ بشکێنم
ئەی مەلی هەزاران هەزار باڵ

*

ئاوی ڕووبار لێڵ هەڵگەڕا
ماسیێ کەوتە بەر قولابی ڕاوچی

100

نە ئاگر دەناسمەوە نە پووش
وەها تێکەڵی یەك بوونە
نە شمشێر ئەناسمەوە نە خوێن
وەها تێکەڵی یەك بوونە
جەستە چەشنێ لە قوڕی مێژوو گیر بووە
نە جەستە دەناسمەوە نە قور
زمان وەها تێکەڵ بە بوون بووە
نە پیتەکان ئەناسمەوە نە ڕستەکان
سەرم وەها
تێکەڵ بە مەجازی گومان بووە
نە نەفریشتە دەناسمەوە نە شەیتان

*

سێرەی گەلێ تفەنگی پووت
بۆسەر تەختی نێو چەوانم لە بۆسە بوون

## 101

که زمانم پڕا فەزا پڕ بوو لە گیای شیعر
مەلی زمانم لە نێو ڕەوزان هێناوە
کە دەنگم شکا دەریا پڕ بوو لە مرواری
دەنگی شکاوم بە زەبری هاوار هێنایەوە
کە ڕەنگم پەڕی
دارستانەکان سەوز هەڵگەڕان
ڕەنگی پەڕیوم بە زەیتی ئەبەد هەڵێنایەوە
کە خوێنم ڕژا
سەر زەوی سوور سوور هەڵگەڕا
ئەو خوێنە چۆن کۆکەمەوە؟

*

بەر لەوەی فێراپت من بکا بە تەریوەی زەمان
شکاندت ئەو دڵەی سەد ساڵە
وێنەی تۆم لە مینای خوێنینی گرتووە

102

به دوای ڕستەیێ ئەگەڕێم
ئەبەدییەت لە نێو دڵی چرکەساتێ بخەملێنێ
تاریکایی هەموو دونیا
لە نێو چاوی تاقە مۆمێ داگیرسێنێ
ڕۆح لە مەرگ بشارێتەوە
چی نهێنی ژیان هەیە لە نێو ملی ئاشکرایی
وەکو زیو شەوق داتەوە
ئەمەوێ وابکەم .
کەی وەك هەتاو دێیتە ناو بورجی منەوە ؟

*

ئەی ئاوونگی شکاوی سەرپەڕەی کتێبی ئەبەدیم
ئێستاکە لە ماڵی تەنهایی
بۆ کتێبێ ئەگەڕێم کتێبی بینایی

103

برینە گەشەکانم بەو تروسکە کزانەی
کە لە نێو ڕۆحماندا ماون سارێژ کرد
بۆ چەند ساتێ حەساینەوە
بەڵام هەمدیس لەبەردەم ڕەشەبای تووڕە
بووین بە درەختێکی کلۆر
خۆمان نەگرت شکاینەوە

*

هێشتا کڵپەیێ دەمێنێ
ئاگری دڵمان خۆشکاتەوە

104

له کتێبی گوماندا پەرەگراقێکم دۆزییەوە
تراژیدیای ژیانی تیابوو
له دڵی پەرەگرافەکەدا
ڕستەی یەقینێ ڕایتەکاندم
لەگەڵ ڕستەی هەموو جیهاندا جیا بوو
له نێو ڕستەکەدا وشەیەکم دۆزییەوە
لەفەرهەنگی هیچ بوونەوەرێ نەمابوو

*

لەناو هەموو کتێبێکا
ڕستەیێ دەدرەوشێتەوە

105

ڕاوچی بەدوای نێچیر کەوتووە
گۆرانی بۆ دەچڕێ و ئەیلاوێنێتەوە
پاشان شەرابی سووری بەسەرا هەڵئەقوڕێنێ
مناڵەکە بە تامێکی ئەبەدی
سەری مارەکەی  گرتووەو هەڵیدەمژێ
گۆڕ هەڵکەن گۆڕ لێدەداو نوکتە دەگێڕێتەوە
عاشقەکەش دڵی پڕ ئاگرە
ڕووت و قووت
بە ناو زریانی ژیان دەسووڕێتەوە

*

هەر شاعیرەو ئاگری خۆی هەیە
هەر ئاگرەو دوکەڵی خۆی هەیە

## 106

لەمێژ بوو  لە قیتارەکە دابەزی بووم
کەبیرم کەوتەوە
کتێبی گوڵە بەدیۆمەکانی بۆدلێرم
لای کچەکە جێهێشتووە
بەڵام زوو بیرم کەوتەوە کە ئەویش
هەموو جوانییەکانی لەناو دڵم جێهێشتووە
بە جوانییەکانی ئەو
سەدان ساڵ ئاگری دڵ دائەگیرسێنم
بۆ کتێبەکەش سەدان ساڵ
ئاگری سەر ئەکوژێنمەوە
بە جوانییەکانی ئەویش سەدان ساڵ ئەسووتێم

*

ئێستاش پارچەی شکاوی رۆحم
لە باخەکان دەبریسکێنەوە

107

وەك ڕەفەیەك لە كتێبان چۆلكرابێ
وەك تەلارێ ستوونەكانی ڕمابێ
یا سینەیێ شووشەی ڕۆحی لێ شكابێ
یا وەك كوانووی موغێكی پیر
كە ئاگری لێ بڕابێ
یاخود شیعرێ چەمك و مانای لێ دزرابێ
یا درەختێ لق و پۆپی هەڵوەرابێ
وەك كەشتیێ شەپۆل و گێژەنی تووشی لێ ئاڵابێ
ئاوا تەم لوتكەی گرتوومە
چەشنی ئازادی نێو قەفەس
حەسرەتیەتی بەرەلا بێ

*

كەشتی ژیانم گێژەن قووتی دا
لەدوور دوورەوە
گۆزەی شكاوی رۆحم دەبینم

108

بەسەر ڕێگاکانەوە وەستام ژیان پڕ بوو لە هاوار

کتێبی وجودم کردەوە  ژیان پڕ بوو لە مەینەتی

ئەی ژیان من لە دەست تۆ ڕادەکەم

سواری سەر پشتی با ئەبم تۆ هەر لە گەڵمای

دوور دوور ئەڕۆم تۆ هەر بەدوامەوەی

ئەی ژیان من لە دەست تۆ ڕادەکەم

دواجار پەی بەوە ئەبەم کە من خۆم ژیانم

ئەوە هەرخۆمم بەدڵێکی خەمگین

بە ڕۆحێکی بریندار لە دەست خۆم ڕادەکەم

*

زریانی زۆر تووش و فەوتێن

خوێنی جەستەیان مەیاندووم

## 109

بەسەر پشتی نەهەنگی وەڕەسی
لە ژێر ئاوەکەدا مامەوە
ژیان لە نێو شووشەی کپیدا شەرابێکی کۆن بوو
سەرم پڕ بوو لە خەیاڵ
هەزار دەرگای لێکرایەوە
هزر بە هەزار لادا هەڵرژا
زەمەن لە سووڕانەوەی خۆی کەوت
وەرزەکان تامی ئاویان لێدەهات
هەستم کرد بەختەوەری کەوتۆتە ژێر ئاوەوە
هاوارم کرد ئەی ئاو ئەی ئاو
بمکە ئەسیری خۆت
سەر زەوی چۆڵ بووە لە بەختەوەری

*

زۆر کەرەتان بە شاخی ڕك هەڵزنیوم
هەناسەیان لە نێو سینەدا بڕیوم

## 110

ئەو سەرە ڕمانەی بەردڵم کەوتوون
وەك قەترەی گەشی شەرابێکی سوور
تراژیدیای ژینم بۆ دەگێڕنەوە
دەرکەوتنی تۆ چۆن دارێژمەوە
کە دەرکەوتنت وەك تیری دەرچووی ناو کەوانێکە
هەرچەند ڕابکەم تازە مەحاڵە تیر بگرمەوە
هەوەسێکی زۆر هانم دەداتن
بگەمە خەتی سووری خۆکوشتن
بەڵام کتێبی تەواو نەبووی تۆ
هەمیشە بۆ لای مان لە ژێر بادا
بانگم دەکاتن

*

مرۆڤ بکەوێ هەڵناسێتەوە
کە ئەڤین نەما سەرزەمین هەمووی
وەك بەردی لێدێ

## 111

هەموو هێڵەکانی جەنگی ئەوینی تۆم بڕی
لە هەر هێڵێ برینێکت لە کیانم ئاگردابوو
تا گەیشتمە ئەو سەنگەرەی
کە تۆ سێرەت تیا گرتبوو
دڵت کردبووم بە نیشانە
لەو شەوە تاریك و توونە
جەستەم دەتگوت چلچرایە
کە باوەشم پیا کردی و
دوا سەنگەرم داگیرکردی
گۆزەی دڵم لە ناو ئەو سەنگەرە شکا
دوا دڵۆپ لە خوێنم ڕژا

*

نە با هەڵئەکاو نەباڵدار دەفڕێ
کە ئەڤین هەبێ تا چەکچەکیلەش
بە ڕۆشنایی ئاشنا دەبێ

## 112

که پێکەوەین
لە ژێر پارچە ئاسمانێکی ئەم دونیایە
سەر زەوی پڕ لە ئاو دەبێ
گیا لە سەر تاشەکان شین دەبێ
ڕووبار نەرم نەرم دەڕوا
زەمەن دەبێتە فڕفڕۆك
ڕۆژ هەڵدێت و لە چرکەیەك ئاوا دەبێ
شەرابی سوور دەخورێتەوە
زمانی قسە نامینێ
تای ئەوین جێی دەگرێتەوە
که پێکەوەین

*

گوێ لە زەوی بگرە پێت دەڵێ
رەوەزو ئاو و دارستان بە یەکەوەین

113

کاتێ کە دەێیتە دڵمەوە

بەمن بێت قەت قەت نەچییەوە

چوونەوەی تۆ کیانم وردوخاش دەکات

وەك چۆن کە مانگ ئاوا دەبێت

تریفە دەست بە گریان دەکات

*

تۆ وەك دڵۆپە شەونمی کە لە گیا دەبریسکێتەوە

تۆ وەکو ڕیژنەی ئاگری لە من دادەگیرسێیتەوە

114

به شوورەی ئەوینی تۆوە دەورەدراوم
رزگاریم مەحاڵە
هەردەبێ ڕابکەم تا ماوم
دەزانم کە ناگەم
هیچ ئاماژەیەکیش نییە لەم کەونەدا
وەکو ئاوی ئەوین
بپپرژێتە سەر ئەو بروسکەی
جوانییەکانی تۆی لە من شاردۆتەوە

*

ئەو ڕێگە درێژەی دەیبڕم
رێی جەنگەڵی هات و نەهاتە
ئەوین

115

تەنهات کردم
وەك ئاو ڕۆشتی و بۆ ئەبەد نەگەڕایتەوە
وەکو شنە هەڵت کرد و
جارێکی تر نەهاتییەوە
دڵت بردم و باڵت گرت
کەی ئەو دڵەم دەهێنییەوە ؟

*

پوشی بەربا دەڕوات و ناگەڕێتەوە
دڵی بەر ئەوین ئەسووتێ و ناکوژێتەوە

## 116

دواجار بەر لەوەی خۆی بکوژێ
لە ژێر چەترێکی شین
لە نێو سرووتێکی جەنائیزی
هەندێ لاسکە گوڵی نیلۆفەڕی نابووە دەست و
سەری نابوو بە نێو کتێبکی سپی
بەسەر کورسییەکی جۆلانەوە ئەترینگایەوە
ترینگانەوەی دوای شەرابێکی ئاڵ
بینیم شێتانە لە زەمەن رادەمینێ
زانیم بەدیار دیمەنی ئالۆسکاوی
ئەکەوم و هێزی وەستانم نامینێ
لە دوورەوە دەستی هەڵبڕی و بانگی کردم
من لە یەك ساتدا سەدان هەزار جار مردم

*

تەنها کتێب و قەڵەم بوو
ژیانی پێ والا کردوو
ژیانیشی لێ سەندەوە

171

ژیان مەودا بەمن نادا تەمەنم هەڵبوەشێنمەوە

تا لەگەڵ مانگدا ئاوا ئەبم

لەگەڵ خۆرەتاو دائەگیرسێم

دواجار لەگەڵ مەرگ ئەڕۆم

ئەگەڕێمەوە بۆ ئەبەد

لە بەرامبەرتا دەبم بە بەرد

دەهاوێژرێمە دەریاوە

لە دووریتا دەبم بە ئاو

دەڕێژرێمە بیابانەوە

*

لە ئاورینگی دڵدا وشە

دەبێتە تیشووی هەموو ساتەکان

## 118

دەزانم ڕۆژێ دێ یا لە تۆزی سەر کتێبان
یا بەسەر قاپێکی شەرابدا
لێم ڕوونەو دەزانم ڕۆژێ دێ
یا لە ژێر دیواری ڕماوی قەڵادا
یا لە لەژێر تانکیەکەی مەولەوی
لێم ڕوونەو دەزانم ڕۆژێ دێ
یا لە بارێکی ساردی دووری شار
یا لە ناو ئەشکەوتێکی تاریك
خوێنی من دەوەستێ و دەکەوم
بۆدواجار سەیری پاییز دەکەم
کە گەڵا دەوەرێ

*

ئاوەها دوا هەناسە دەدەم
کۆتایی بەو دڵە بیقەرارەی من دێ

## 119

دەی براکەم ئەم گەمەیە زۆر دەکێشێ
هێندێکمان بۆ ئەولای دونیا تووڕ هەڵدەدا
هێندێکیشمان بۆ بنی دەریا
هەبێ و نەبێ شەراب و خوێن تێکەڵ دەبێ
زەوی دەبێ بە ئاگرو با ملی زەمەن با دەدا
ئەم گەمەیە زۆر دەکێشێ و
بوونی ئێمە دەسڕێتەوە
شوێن پێ نامینێ لە زەوی
هەتا تۆوی حەوت پشتیشمان دەبڕێتەوە
ئێمە مۆرەین هەڵماندەدەن
بە زەوی ناکەوینەوە
ئەم گەمەیە دوور دەکێشێ

*

ژیان گەمەیەکە هەمووومان تیا
یاریکەرین و تێی ناگەین

120

که چوومه لای دەستی نایە ناو دەستمەوە
هەستم کرد دەستەکانم
ئاگریان گرت و پەنجەکانم توانەوە
بەدەم فڕکردنی قاوەکەوە سەیری ناو چاوی ئەکردم
منیش وەك بەرخێکی سەر بڕاو
کە هێدی هێدی خوێنی لەبەر بچێ
وردە وردە ئەمردم
زانیم ئەوە ئوفیلیایە
تای ئەڤین ئەیکاتە ئاگرو
ئێستا نا ئێستا دامئەگیرسێنێ
هاوارم کرد و لەم خەوە بێدار بوومەوە

*

ئەوە مانگ بوو بەر لەوەی ئاوا بێت
تیشکێکی ئاوێنەیی پێ بەخشیم

**122**

لەو سارایە چۆڵ و هۆڵەی نێۆ ڕۆحمدا
هاوارم وەك كریستاڵ شكا
ڕژایە نێو دۆڵی كپی
ئێستاش سواڵەتی هاوارم
داڵانی پڕ نەی كردووە
ئەزانم شەرابی هاواری منە
داروبەردی مەست كردووە

*

هەمیشە هاوارێ لە نادیارەوە دێ
هەمیشە ناڵەیەك بە ئاوازی عەشقەوە دێت و
ئارامیمان پێ دەبەخشێ

123

من شەرابێکی سپیم
قاپم تێکەڵی تەم بووە
زۆر کەڕەتان لە ڕێگاکان
جێگەم لەسەر فەرشی مەرگ ڕاخستووە
تا دەستم بگاتە شینی ئاسمان
بەردم لەسەر بەرد داناوە
من سەرخۆشێکی سپیم
زەیتی سەرم دەسووتێنم
پێکێکم قەڵەمەو
پێکێکیشم شیری خاوە

*

کە ئاگری نادیاری ئەوین داگیرسا
ئەوەی پڕ دەبێ لە زوخاڵ
تەنها کووپەی دڵە

## 124

له هەموو ڕووبارێ شەپۆلێ هەیە
دەنگ و سەدای تۆم بیر دەخاتەوە
له هەموو پاوانێ درەختێ هەیە
ناوی تۆی بەسەر دەبریسکێتەوە
له نێو ئاسماندا زیوەرێ هەیە
تۆ له ئەدگاریا دەتروسکێیتەوە
له ناو دڵیشما شەوقی خوێن هەیە
که تۆ له ناویا دەدرەوشێیتەوە

*

که تۆ له هەموو شوێنێ بیت
شوێنکات نوقمی خۆرەتاو دەبێت

## 125

من تەنها دەستێکم هەیە
ئەوە بۆ چەندین ساڵ دەچێ
خوێنی شیعرو بوڕکانی میهری لەبەر دەچێ
نیوەشەوێ دەستی ڕاستم هەڵسایەوە
دەستی چەپی داگیر کردم
ئێستا ئەو دەستەم هەرچییەك دەیاننووسێ
نەچەمکی هەیە نە مانا
نە جوانی جارانی ماوە
چونکە ڕۆحی شیعری زیندوو
لە نێو خوێنی دەستی چەپم بە جێماوە

*

ئەوە ڕۆیشتنم نییە هەڵمدەپێچێ بەرەو دوور
بە ڵکو ڕێگاکانە

126

له سووڕانەوەی زەماندا
کە جەستەی پڕ درز کردووم
لە نێو تەنگژەی زماندا
کە دەربڕین و گوزارەی زەوت کردووم
هێشتا ژیان لای من دەستی پێ نەکردووە
هەر نەژیاوم
وا هەست دەکەم ئاوێنەیەکی شکاوم
چواردەستە بۆ قووڵایی نێو ئەم ژیانە
فڕێدراوم

*

جیاوازە کە من هەناسە دەدەم
ژیان شتێکی تری ئەفسووناوییە

127

تۆ لەناو دڵی گەرمی زەوی چی دەکەی
ئەی دیارو ئەی نادیار
تۆ لە ژێر دەریای تووش چی دەکەی
ئەی بڵندو بەرزی ئەی نەوی
لە نێو بای خاکەلێوەی ژیاندا چی دەکەی
ئەی دەنگ و بێدەنگی؟
کە لەناو سینەمدا وەك گەڵای لاولاوی
ئاهەنگی سەرت لێ سەندووم و
لە دەمار دەماری ئەو جەستەم ئاڵاوی

*

وەڵامەکان لە پەیوارەوە نابیسترێن
بانگی مرۆڤ سەدای نییە

128

که من وا ڕائەکەم ئەوە بای ئەوینە

ئەمبات و ئەمهێنێ

من دیلی کتێبی عەتری تۆم

بەسەر شان و ملی ئازادی پژاوم

لە ڕێی تۆ بوومەتە ئەبەدو

لە گلێنەی شینی زەماندا ڕژاوم

*

ئەوین هەدادانی نییە

سووتان لە خۆڵەمێش ناگات

129

ئاو هات و بردمی
دوور دوور یەکجار دوور فڕێی دام
زریان هات مانگی لێ شاردمەوە
هەروەکو ئاڵەکۆك تاریکی خواردمی
ڕووناکی لێی نەدام
بووم بە بەرد ساردوسڕ هەڵگەڕام
وەڵامت هەر نەبوو

*

ئەو وەڵامانەی دەیبیستین
وەڵامی زمانە هی ڕۆح نییە

130

مێرووله چەند یچووکه

زێدی شیرینی خۆی هەیە

درەختەکانیش دارستان

هەتا چیاش زنجیرەو رەوزی هەیە

پڵنگ و شێر بێشەی گەرمی خۆیان هەیە

سکڵ ئاگرو دوکەڵ و هەم ئاگردان

تەنها منم ئەسوورێمەوە لە زەوی

بێ نیشتیمان

*

ئەوین لە ناو دڵدا زیندووە

ئاواش زێد

## 131

کیمیای ژەهرێکی نادیارە
دووری تۆ
دەپرژێتە ناو بازرقەی خوێنمەوە
بەڵام هەمدیس بۆ من شەرابێکی خەستە
دڵۆپ دڵۆپ لە لێواری تەنهاییما
دەیخۆمەوە

*

ئەوین لە ناو دڵدا زیندووە
ئاواش زێد

132

له مه‌لێكه‌وه بۆ مه‌لێ
فێری ده‌رسی فڕین ده‌بم
له ناڵه‌یه‌كه‌وه بۆ ناڵه‌یێ
هۆگری كتێبی گرین ده‌بم
چه‌ند ئه‌سته‌مه
كاتێ بۆ ساتێ پێت ده‌گه‌م
سه‌ده‌یه‌ك دوور ده‌كه‌وییه‌وه

*

ئاوازه‌كان هه‌موویان وه‌ك یه‌ك نین

133

یاقووتی ڕووت
لە ناو تاریکایی شەوە
هیوا لە ناو دڵێکی ماندووە
دڵیش لە ناو قەفەزی سینە شکاوە
چۆن بگەم بە تۆ ؟

*

ئەوە ڕازێکە بۆخۆمی دەدرکێنم ئەی ڕۆح
کە ئەوەندە ئازارباری

134

له نێو گەرداوی ئەم ژاوە ژاوە

زمانی ئاماژە سیس هەڵگەڕاوە

زەمەن ماندووە

زەمین بڵێسەی خۆی لە دەست داوە

تاشەبەرد جوانی

کەنار شەپۆلی

دامێن گیای خۆی

بەڵام ئەی شیعر

ئەوەی کە تۆوی درەوشانەوە دەبەشێتەوە

بە تەنها هەر تۆی

*

هەتا درزێك بمێنێ

جوانییەکانی ژیانی تیادا دەدرەوشێتەوە

135

له نێو هه‌موو دارستانێ

قه‌دێ هه‌یه ناوی تۆی له‌سه‌ر نووسراوه

له نێو هه‌موو ئاگردانێ

سكڵێ هه‌یه ئه‌وه منم داگیرساوم

له لای هه‌موو باخه‌وانێ

له ژێرسای هه‌ر ئه‌رخه‌وانێ

ئه‌وه منم له پێشوازیتا وه‌ستاوم

*

ئه‌و كاتانه‌یه كه ڕۆح هه‌ڵده‌پڕووكێ

دڵ ده‌گری

## 136

دێمەوە لات قوفڵی زمانم دەشکێنم
ئەو تیرانەی بەر دڵم کەوتوون
ئەو بەورانەی هەڵدێران و
ئێستا لە نێو گۆڕستانی دڵم خەوتوون
هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە
هەرچییەك سەریهەڵدابێ
هەرچییەك ئاگری شیعری
لە دەفتەری دڵ بەردابێ

*

هاڵەکۆك چاوەڕوانە ئاسمانی شین ببینێ
بەڵام هەمیشە بەفر دایدەپۆشێ

## 137

دڵۆپێ نەما لە شەرابی سوور
لەناو ئەڵماسی دەرکەوتنی تۆ
کە نەیخۆمەوە
کتێبێ نەما پڕ لە مانای قووڵ
لە ناو پەرداخی گەڕانەوەی تۆ
کە نەیخوێنمەوە
چەمکێ نەماوە لە نادییاری تۆ شیی نەکەمەوە
بۆیە دەزانم کە پەیواری تۆ
لە ناو دوا دڵۆپ خوێنێکی ئاڵە
کەوا لە جەستەم بێتە خوارەوە
چونکە بە تەنها بانگی ئەوینە
هاوتای مەحاڵە

*

جریوەی مەل بڕایەوە
کە دڵی درەخت کوژایەوە

**138**

تۆ نەبای لەمێژ بوو

بەرکەمەندی مەرگ کەوتبووم

تۆ نەبای لەمێژ بوو

لەبەر بای زەمەندا

خوێنی شیعرم بەسەر تاشەکان ڕژا بوو

ئەی جیلوەی هەبوونی ئەبەدیم

تۆ نەبای قەڵەمم کوێر ئەبوو

تۆ نەبای

❊

هەموومان بە یەکەوە ژیان دەنووسینەوە

ژیانیش بە تەنها ئێمە دەنووسێتەوە

یەکێ لە گرفتە دێرینەکانی ئەشقی شاعیر، ئەوەیە هەرگیز دەستی لە شیعرەکانی خۆی بەرنابێ، بۆیە هەمیشەو بەردەوام شیعرەکانی بۆ ئەو، وەکو کێلگەیەکی لێدێ، بە درێژایی ئەزمونی خۆی کاری تیا بکات و پاکی کاتەوە، دوکەڵی ناو فەزاکانی بڕەوێنێتەوە، بۆیە منیش هەر لەیەکەم چاپی خاک و هەڵۆ وە تا وەکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێ، هەمیشە وەکو کەسێ گەوهەرێکی لەبن دارو پەردوی ئەم کێلگەیەدا ون کردبێ، بەناویا دەسوورێمەو کاری لەسەر دەکەم. ئەو چەند بەرگەی لە بەردەستانایە، ژیان و ئەزمونی شیعری منە، گریان و پێکەنینی منە، هەڵوێست و ئەوینیمنە، بۆ هەموو ئەوانەی کە لەمەودوا دەیانەوێ ئیش لەمەڕ شیعرەکانی من بکەن، پێم باشە کە ئەم چەند بەرگە بکەن بە سەرچاوەی ڕاستەقینەی بەرهەمە شیعریەکانم، پشت بەو چەند بەرگە ببەستن، کە من لە ئێستادا بە سەرەتاو دواهەمین قۆناغی دیدگاو شیعرییەتی خۆمیان دەزانم.